**هەندێ جار پاشەکشە بە واتای شکست نیە بەڵکو بۆ ئەوەیە بازێکی بەهێزتر بهاوێژی**

ناوی کتێب : سەرکردایەتی

ناوی نوسەر: برایان تیسی

وەرگێران : شەپۆل مامەش

نەخشاندن : هەڵمەت عباس

تیراژ:(١٠٠٠)

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

ساڵی چاپ : ٢٠٢٣

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (    )ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

# ناوەرۆک

## پێشەکی لەلایەن نووسەرەوە

ئۆلیڤەر وێندێل هۆڵمز (دادوەری بەناوبانگی دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جارێک وتی کە سێ پۆلی مرۆڤ هەیە : پۆلی یەکەم ئەوانەن کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری و دروستبوونی دیاردەی نوێ، پۆلی دووەم، ئەوان تەنها چاودێری دەکەن بزانن چی ڕوودەدات، و لە کۆتاییدا پۆلی سێیەم لەم کتێبەدا دەمانەوێت باس لە سەرکردایەتی و ئەو کەسانە بکەین کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری و دروستبوونی دیاردەی نوێ . لە کۆمەڵگای ئێمەدا پێویستی بە سەرکردایەتی تەواو دیارە.لە خێزانەکان، کۆمپانیاکان کاروباری ئابووری، کۆمەڵە تایبەت و گشتیەکان، هەروەها حکومەتەکان، پێویستمان بە سەرکردایەتی هەیە، زیاتر لە ڕابردوو پێویستمان بە سەرکردایەتی هەیە، هەروەها پێویستمان بە سەرکردایەتی هەیە بە تایبەتی بۆ ئەوەی بەرەو داهاتوو هەنگاو بنێین، پێویستمان بە کەسانێکە کە دید و بوێری پێویستیان هەبێت و بتوانن بوارەکانی نوێ بناسن و دەرفەتی بەنرخ درەوستبکەن . بە گشتی پێویستمان بە دوو جۆر سەرکردایەتی هەیە، جۆری یەکەمی سەرکردایەتی کە گرنگترین و بنەڕەتیترین جۆریەتی ، پێی دەوترێت سەرکردایەتی کارلێکەر. سەرکردەی کارلێکەر ئەو کەسەیە کە پێکەوە لەگەڵ کەسانی تر لە ڕێگەی ئەوانەوە کاری جۆراوجۆر بە ئەنجام دەگەیەنێت. جۆری دووەمی سەرکردایەتی پێی دەوترێت سەرکردایەتی گۆڕانکاری. ئەم جۆرە سەرکردانە زەمینە بۆ گۆڕانکارییەکان ئامادە دەکەن، ئەم سەرکردانە دیدگایەکیان هەیە بۆ ئاینده و پاڵنەر و دوو قات لە مرۆڤەکاندا

دروست دەکەن بۆ ئەوەی ئەم کەسانە بتوانن لە ئاستێکی زۆر زیاتر لە ئەدای ئاسایی خۆیان ئەنجام بدەن. ئە مڕۆ پێویستی سە ڕکردایە تی لە ڕێکخراوە جۆراوجۆرە کاندا، بە تایبە تی نوسینگە ئابوورییە کان، زۆر چڕترە . چونکە ئە و کە سانە ی تێدا کاردە کە ن، زۆر پێداگرتر و پرداواکاری و وردتر و خۆویست تر لە هە ڕ قۆناغێکی ڕابردوون. لە دونیای ئەمڕۆدا ئیتر ناتوانرێت ئەرکێک بە کەسێک بسپێردرێت و ڕێنمایی بدرێت بۆ ئەوەی ئەو کارە بکات. ئەمڕۆ فەرمانبەران دەیانەوێت بەشداری پرۆسەی کاروبارەکان بکەن. دەیانەوێت لەگەڵ بەڕێوەبەران باس لە کارەکانیان بکەن و فیدباکێکی(پێڕاگەیەندنەوە) بەردەوام لەسەر ئەدای کارکردنیان وەربگرن. دەیانەوێت بزانن چۆن ئەنجامدانی هەر کارێک سوودی بۆیان هەیە. ئەمڕۆ ، کاتێک کەسێک بە دوای گەران بۆ کار دەچێتە شوێنێک ئەم پرسیارە گرینگەی لە هزردا هەیە ؟" بۆچی لێرە کار بکەم؟" یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی چوونی خەڵک بۆ کارکردن بۆ هەندێک کۆمپانیا، بەهۆی جۆری سەرکردایەتییەوەیە کە هەیانە. دوو پێناسەی زۆر جوان هەیە سەبارەت بە سەرکردایەتی - بە تایبەت لە کارگە ئابوورییەکان کە حەزی زۆرم بۆیان هەیە. پێناسەی یەکەم ئەوەیە:
سەرکردایەتی بریتییە لە توانای بەدەستهێنانی ئەدای کارکردن لە دەرەوەی چاوەڕوانی لە ڕێگەی بەکارهێنانی کەسانی ئاسایی.

**پێناسەی دووەم ئەمەیە:**

سەرکردایەتی، واتە توانای ڕاکێشانی کۆمەڵێک شوێنکەوتوو.

ئەمڕۆ ئەو سەرکردایەتییەی پشت بە پێگەی ڕێکخراوەیی ، سامان یان دەسەڵاتی کورتخایەن دەبەستێت، ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت. بەپێچەوانە تەنها یەک جۆر سەرکردایەتی بەردەوام هەیە. لەم جۆرە سەرکردایەتیەدا مرۆڤەکان خۆیان بڕیار دەدەن ڕێنمایی و و دیدگای کەسێکی تر قبوڵ بکەن. بە واتایەکی تر، سروشتی خۆبەخشانەی شوێنکەوتن بە باشترین و گرنگترین تایبەتمەندی سەرکردەکانی ئەمڕۆ هەژمار بکرێت.

# بەشی یەکەم

## کەس لە سەرەتاوە سەرکردە نییە

من لە تەمەنی هەرزەکارییەوە دەستم بەم ڕێگایە کردووە و یەکەم سەرکردە کە بە وردی لە ژیانی خوێندوومەتەوە، هانیباڵ، فەرمانڕەوای کارتاژ بوو. زۆر کتێبم خوێندەوە دەربارەی جەنگەکانی پونیک و بەزاندنی فیلەکانی هانیباڵ لە بەرزاییەکانی ئەلب و شەڕی دژی ڕۆمەکان. هانیباڵ دەیتوانی ژمارەیەکی کەم سەرباز بە هەزاران کیلۆمەتر لەگەڵ خۆیدا ببات و وەک هێزێکی زۆر بەهێز لە شەڕەکاندا بەکاریان بهێنێت و گەورەترین ئیمپراتۆریەتەکانی سەردەمی خۆی تێکبشکێنێت.

دوای ئەوە لێکۆڵینەوەم لە ژیانی ئیسکیپیۆ کرد، ئەو فەرماندەیەی کە هانیباڵ شکستی هێنا، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی وردم لە ژیانی ناپلیۆن و ویلنگتۆن کرد بۆ ئەوەی جیاوازی نێوانیان بزانم. هەروەها باسی جۆرج واشنتۆن لینکۆڵن و فەرماندەکانی وەک جۆرج پاتۆن و دوایت ئایزنهاوەر و عومەر برادلیم خوێندەوە کە هەموویان لە گەورەترین سەرکردەکانی سەردەمی خۆیان بوون. لە کۆتاییدا گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە سەرکردەکان لە سەرەتاوە و بەر لە دایک بوونەوە ئەم تایبەتمەندیانە بەدەست ناهێنن، بەڵکو بە تێپەڕبوونی کات توانای پێویست فێر دەبن.کەس بە سرووشتی بە تواناکانی سەرکردە لەدایک نابێت، تەنانەت ئەسکەندەری گەورە لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە فێربووکە چۆن سەرکردە بێت.

## لێکۆڵینەوە لە سەرکردە گەورەکان

لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بە سەرکردە گەورەکانی ڕابردوو و ئێستا یەکێکە لە خێراترین و دڵنیاترین ڕێگاکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو سیفەتانەی کە پێویستن بۆ سەرکردایەتیکردن. تا زیاتر لەبارەی ئەو سیفەتانەی کە پێویستن بۆ سەرکردایەتییەکی ناوازە بخوێنیتەوە، ئەگەری ئەوە زیاترە کە ئەم بەها و ڕەفتارانە لە خۆتدا بچێنیت. دوای ماوەیەک ئەم بەها و ڕەفتارانە لە شێوەی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەیت و ئەو ئەنجامانەی بەدەستی دەهێنیت خۆیان نیشان دەدەن.

ئەبراهام لینکۆڵن لە شوێنێکدا وتی کە ئەوەی کە هەندێک کەس لە ڕابردوودا سەرکەوتوو بوون بەڵگەیە بۆ ئەوەی هەندێکی تر دەتوانن سەرکەوتنی لەو شێوەیە بەدەست بهێنن. هەروەها بێرتراند ڕوسیل (فەیلەسوفی بەناوبانگ) لەگەڵ ئەم بیرۆکەیەدا هاوڕایە و لە شوێنێکدا دەنووسێت(( کە باشترین بەڵگە بۆ ئەوەی شتێک مومکینە، ئەوەیە کە مرۆڤەکانی دیکە لە ڕابردوودا ئەو کارەیان کردووە.))

بیر لەو سەرکردانە بکەرەوە کە دەیانناسیت و سەرسامیت پێیان ، پاشان بزانە چۆن دەتوانیت ڕەفتارەکانیان وەربگریت. بیر لەوە بکەرەوە کە چۆن دەتوانیت زیاتر لەوان بچیت. پاشان دوای ماوەیەک بۆت دەردەکەوێت کە ئەم سیفەتانەت هەڵمژیوە و خۆت بوویت بە سەرکردە.

## چیرۆکی ئەسکەندەر

چیرۆکی ژیانی ئەسکەندەری مەزن دەتوانێت فێرکاری بێت بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ئاستێکی بەرزی سەرکردایەتی بەدەستبهێنن.

ئەسکەندەر لە تەمەنی پانزە ساڵیدا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە چارەنووسی ئەو هیچ نییە جگە لە زاڵ بوون بەسەر هەموو ئەو خاکانەی کە لەو سەردەمەدا ناسراون، یەکخستنی هەموو خەڵکی ئەو سەردەمە و دروستکردنی برایەتی و یەکسانی لە نێوانیاندا دیدگای ئەسکەندەر بوو، ئەسکەندەر مامۆستایەکی وەک ئەرستۆی هەبوو و ساڵانێک هەوڵیدا ئامادەکاری بکات خۆی پەروەردە کرد. لە داهاتوودا خۆی وەک پاشایەکی گەورە دەبینی و باوەڕێکی نەلەرزاوی هەبوو بە تواناکانی بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە دیاری کردبوو.

ئەسکەندەر لە بواری بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی کاروبارەکاندا زۆر بەتوانای هەبوو. هەروەها توانایەکی زۆری هەبوو لە ڕاسپاردن و دانانی فەرماندەی شیاو لە پۆستە شیاوەکاندا لە کاتی گونجاودا. جگە لەمەش، ئەسکەندەر لە پلاندانان و ڕێکخستن و خەیاڵکردنی داهاتوو و جێبەجێکردندا زۆر وەستابوو

لە شەڕی ئەربلە، لە ناوچەیەکی بەشی ڕۆژهەڵاتی عێراقی ئەمڕۆ، ئەسکەندەر بە سوپای ٥٠ هەزار کەسییەکەیەوە ڕووبەڕووی سوپای یەک ملیۆنی بەهێز و ئیمپراتۆریەتی بەهێزی فارس (ئێران) بووەوە و شکستی پێهێنان. هەرگیز بیری لە شکست نەدەکردەوە، ئەسکەندەر بڕوای تەواوی بە تواناکانی خۆی و ژێردەستەکانی و توانایان هەبوو بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو ئەو کێشە گەورە و بچووکانەی کە دەخرانە بەردەمیان. ئەسکەندەر وەک هەموو سەرکردە گەورەکان توانای ڕێکخستنی ژێردەستەکانی و پاڵنەریان هەبوو بۆ تێپەڕاندنی هەموو سنووردارکردنەکان و ئەنجامدانی کارە بەدەر لەتواناکان. هەروەها سەرنجی خستە سەر خاڵە بەهێزەکانی و بوارە گرینگەکانی کە بۆ سەرکەوتنی جەوهەری و گرینگ بوون.

لێکۆڵینەوە لە ژیانی ئەسکەندەر و ئەو ڕووداوانەی لە مێژوودا ڕوویانداوە، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زۆربەی ئەو تایبەتمەندییانەی هەبووە کە لە لێکۆڵینەوە لە ژیانی سەرکردە گەورەکانی جیهاندا بەدەست هاتوون.

## خۆت بە سەرکردە بزانە

لە پێشەکی ئەم کتێبەدا باسم لەوە کرد کە مرۆڤەکان لە ڕووی تواناکانی سەرکردایەتییەوە لە سپێکترۆمێکی بەردەوامدا دانراون، لە کۆتایی ئەم سپێکترۆمەدا کەسانێک هەن کە نازانن چ گۆڕانکاری و ڕووداوێک ڕوودەدات، و لە لوتکەی ئەم سپێکترۆمەدا یەک یان دوو لەسەدی مرۆڤەکانن لە کۆمەڵگادا، کە هۆکاری سەرەکی هەموو گۆڕانکارییەکانن، هەریەکەمان جێگەی خۆی لەم سپێکترۆمەدا هەیە و ئەو کارانەی لە ڕۆژدا ئەنجامی دەدەین و ئەو وشانەی دەیڵێین جێگەی خۆمان لەم سپێکترۆمەدا دەجووڵێنن بۆ سەرەوە یان خوارەوە .

ئەگەر دەتەوێت ببیتە سەرکردە یان تواناکانی سەرکردایەتیت بەهێزتر بکەیت ئەوە لەبیرت بێت کە هەموو شتێک پەیوەستە بە تۆوە، پێشکەوتن لە بواری سەرکردایەتیدا پەیوەستە بە تۆوە، یان وردتر بڵێم، لەسەر بیروباوەڕی دەروونی خۆت. تۆ ئەو جۆرە کەسەی کە پێت وایە چەمکی خۆت ئەدای تۆ دیاری دەکات. بە گۆڕینی چەمکی خۆت - شێوازی بیرکردنەوە و باوەڕت بە خۆت وەک سەرکردە - دەتوانیت ببیتە سەرکردەیەکی زۆر کاریگەرتر.

هەموو شتێک پەیوەستە بە "یاسای هۆکار و کاریگەرییەوە". یاسای هۆکار و کاریگەری بنەڕەتیترین یاسای جیهانە و یاساکانی تری بیرکاری یان زانستەکانی تر بە جۆرێک لە جۆرەکان ژێرکۆمەڵێکن لەم یاسایە. یاسای هۆکار و کاریگەری دەڵێ هەموو ڕووداوێک لە هۆکارێکی دیاریکراو دروست دەبێت، هیچ شتێک بێ هۆ نییە، ئەمەش مانای ئەوەیە سەرکەوتنی هەموو مرۆڤێک هۆکارێک یان چەند هۆکارێکیتری هەیە.کەواتە ئەگەر دەتەوێت وەک کەسێکی تر سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، و

لێکۆڵینەوە و مۆدێلی ڕەفتارەکانیان و چۆنیەتی کارکردنیان کە بووە هۆی سەرکەوتن .دواجار ڕێگای ئەوان بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن بناسە، بۆ ئەوەی دواجار خۆت سەرکەوتن بەدەست بهێنیت. دووبارە و سێبارە ئەوەی کەسانی سەرکەوتوو کردوویانە دووبارەی بکەرەوە تا دواجار هەمان ئەنجامت دەست دەکەوێت.

یاسایەکی دیکە کە بوونی هەیە پێی دەوترێت "یاسای باوەڕ". ئەم یاسایە دەڵێت ئەگەر بەجدی باوەڕت بەشتێک هەبێت ئەوا ئەو باوەڕە دەبێتە واقیعی تۆ، بە واتایەکی تر دەبێتە ئەو شتەی کە باوەڕت پێیەتی، ویلیام جەیمس (فەیلەسوفی بەناوبانگ) فەرموویەتی: "باوەڕەکان ڕاستی بابەتیی دروست دەکەن" .

مەبەست لەم کتێبە بەهێزکردنی تۆیە بۆ ئەوەی ببیتە سەرکردە. هەروەها ئەگەر لە ئێستادا سەرکردەیەکیت، ئەم کتێبە یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی ببیتە سەرکردەیەکی کاریگەرتر. بە پێداچوونەوە بە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە، دەتوانیت هەندێک تایبەتمەندی و هەڵسوکەوتی کاریگەرترین سەرکردەکانی مێژوو بناسیت و بە جێبەجێکردنی ئەو تایبەتمەندیانە، دەتوانیت بیانکەیتە ڕاستی لە ژیانتدا.

## بەشی دووەم

## سەرکردەکان ئەرک و پەیامیان بۆ خۆیان هەیە

سەرکردەکان دیدگا و هەروەها ئەرکێکیشیان هەیە کە بە هاوکاری ئەاون و هاندان بە ژن و پیاوی دیکە دەبەخشێت و بەم شێوەیە کەسانی دیکە هاوکار دەبن بۆ گەیشتن بەو ئەرکە. لە ڕاستیدا لە هەمووماندا ئارەزووی گەیشتن بە شتێکی گەورەتر لەدەرونمان خۆی حەشار داوە. سەرکردەکان دەتوانن بە قوولی پاڵنەر و ئیلهام و هاندەربن بۆ خەڵک و بەم شێوەیە بۆگەیشتن بە دیدگای پەیوەندیدار.پابەندیان بکەن.

بۆیە وەک سەرکردەیەک دەبێت ئامانجێکت هەبێت کە پاڵنەر وهاندانت بەرز بکاتەوە، بێگومان دەبێت گرنگی بەم خاڵە زۆر گرنگە بدەیت کە تەنها ئامانجی چۆنایەتی دەتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان جۆش و خرۆش و پاڵنەر بن. هیچ کەس پەرۆش و تامەزرۆی ئامانجەکانی وەک بەرزکردنەوەی نرخی پشکی

کۆمپانیاکە لە بازاڕی بۆرسەدا یان بەدەستهێنانی پارەی زیاتر یان پلەبەرزکردنەوەی کار بە مانا ڕاستەقینەکەی ناکات، بەڵام لە لایەکی ترەوە هەمووومان دەبینە ئامانجی وەک دیزاینکردن و دابینکردنی بەرهەمێک یان خزمەتگوزاری کە خەڵک پێویستی پێیەتی. بوون بە  باشترین کۆمپانیا یان بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گەورە لە پێشبڕکێکەدا دڵخۆشمان دەکات توشی سەرسوڕمان دەبین.

**هەموو هەوڵێک بدە بۆ ئەوەی باشترین بیت**

 گرنگترین دیدگا کە دەتوانیت بۆ خۆت وەک سەرکردەیەک هەتبێت، بیرکردنەوە لە سەرکردایەتیکردن و باشترین بوونە، پێویستە هەمان ئەو دیدگایە لە چالاکییە ئابوورییەکەت یان ڕێکخراوەکەتدا جێبەجێ بکەیت.  نابێت بە هیچ شتێکی کەمتر ڕازی بیت لەوەی کە باشترین بیت لەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت. لە چالاکی ئابووریدا ئەم پرسیارە لە خۆت بکە :

کام تایبەتمەندی کوالیتی لە بەرهەم یان خزمەتگوزاریدا بە پێی کڕیارەکان گرنگترین و پێویستترینە؟  دوای دەستنیشانکردنی ئەم تایبەتمەندییە، پێویستە هەموو وزە و داهێنەری کارمەندان و بەڕێوەبەرەکانت لەسەر بەدەستهێنانی ئەدای باڵا لەو بوارەدا چڕ بکەیتەوە.  دەبێت باشترین بیت، هەرگیز ناتوانیت هەست بە گەورەیی بکەیت یان خۆت بە توانای بەدەستهێنانی ئەدای نائاسایی ببینیت، مەگەر خۆت لەگەڵ باشترین کەسەکان لەو بوارەی چالاکییەکەدا ڕێکبخەیت و هەموو هەوڵێکت نەخەیتە گەڕەوە.

**ئامانجە بەرزەکان لە ڕێکخراوەکەتدا بە دامەزراوەیی بکە**

پابەندبوون بە ئەرکێکی دیاریکراوەوە مانا بە کارکردن دەبەخشێت .وەک مرۆڤ هەمووومان پێویستمان بە مانا و ئامانجی بەرزە لە ژیاندا بە هەمان شێوەی پێویستمان بە خۆراک و ئاو و هەوا هەیە. هەموومان مرۆڤ پێویستمان بە هەستکردنە بە بەها، سەرکردە گەورەکان وامان لێدەکەن هەست بە بەها و گرنگی بکەین. ئەوان وامان لێدەکەن هەست بکەین ئەوەی ئێمە دەیکەین بەهایەکی زۆر لە ئەرکەکانی ڕۆژانە زیاترە، هەستمان پێدەبەخشن کە ئێمە بەشێکی جیانەکراوەی تیمێکین کە ئەرکێکی گرنگمان هەیە.

چوار هۆکار هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ هەست بە گرنگی بکات، هەموویان بە پیتی A دەست پێدەکەن، یەکەم فاکتەری "قەدرزانین"ە، هەموو دەرفەتێک بەکاربهێنە بۆ قەدرزانی و سوپاسی خەڵک بۆ کوالێتی بەرزی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەن و ئەو ڕۆڵەی تێیدا دەیگێڕن سەرکەوتنی ڕێکخراوەکە. کاتێک سوپاسی کەسێک دەکەیت، ئەو هەستە بەهێزتر دەکەیت کە ئەو کەسە بەنرخە و بەم شێوەیە پاڵنەرێکی زیاتر دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی نیشان بدات کە باوەڕت بەو کەسە بێهودە نییە.

فاکتەری دووەم بۆ ئەوەی مرۆڤەکان هەست بە گرنگی و بەنرخ بکەن، دانپێدانانە بە دەستکەوتەکانیان. هەموو دەرفەتێک بقۆزنەوە و پشتگیری و ستایشی خۆتان دەربڕن بۆ دەستکەوتە گەورە و بچووکەکانیان ، ئەو پێشنیار و چارەسەرانەی کە پێشنیاری دەکەن، و بیرکردنەوەکانیان بە گشتی. کاردانەوەی خەڵک بەرامبەر بەم دەستخۆشیانە سۆزداری دەبێت و خۆبەگەورەزانین و هەستکردن بە بەهای خۆیان زیاد دەکات. بێگومان پێویستە گرنگی بەو ڕاستییەش بدەیت کە ستایشەکە دەبێت تایبەت و ڕاستەوخۆ بێت بۆ ئەوەی هەستی تایبەتمەندیان بەهێزتر بکات.

ڕێگای سێیەم بۆ ئەوەی مرۆڤەکان هەست بە گرنگی و بەنرخ بکەن ، دەستخۆشیکردنیان ئەوەیە کە بەردەوام ستایشی کارمەندەکانت بکەیت بۆ سیفەتەکانی وەک بەردەوامیی ئامێرەکانیان (بۆ نموونە ئەو جلانەی لەبەریان دەکەن) یان ئەو دەستکەوتەکانەی کە باسیان دەکەن .

بەڵام ڕەنگە ڕێگای چوارەم بە گرنگترین ڕێگا هەژمار بکرێت بۆ بەهێزکردنی هەستی گرنگ و بەنرخ بوون لە مرۆڤەکاندا و ئەم ڕێگایە جگە لە سەرنجدان هیچی تر نییە. ئەگەر خەڵک بەردەوام پشتگوێ بخرێن و پشتگوێ بخرێن، پابەندبوونیان بە بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە کەم دەبێتەوە. ئەگەر تەنها ڕێنماییان پێ بکرێت و هیچ دەرفەتێکیان پێنەدرێت بۆ بەشداریکردن یان پێشکەشکردنی فیدباک(پێڕاگەیاندنەوە )، ئەوا هەست دەکەن کە ڕۆڵێکی کەمیان هەیە لە بەدیهێنانی ئەو ئەرکەی کە بۆیان دیاری کراوە.گرنگیدان واتە گوێگرتن لە خەڵک بەبێ ئەوەی باز بدەیتە ناو گفتوگۆکانیان، ئەمە بەو مانایە نییە کە مەرجە پێشنیارەکانیان قبوڵ بکەیت یان لەگەڵ هەموو قسەکانیان ڕازی بیت، بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە دەرفەتێکیان پێ بدەیت بۆ ئەوەی قسەکانیان بیڵێن.

**هۆکاری هاوبەش**

باشتر وایە ئامانجێک یان ئەرکێک دابنێیت، ڕێگایەکی ڕوون نەک تەنها بۆ ڕێکخراوەکە بەڵکو بۆ هەریەک لە کارمەندەکانیشی. ئامانجی باش هەموو مرۆڤەکان لە دەوری ۆامانجی هاوبەش یەکدەخات. بۆ نمونە کۆمپانیای IBM یەکێکە لە کۆمپانیا پێشەنگەکانی مێژووی بازرگانی جیهانە. یەکێک لە ئامانجەکانی ئەم کۆمپانیایە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە بۆ کڕیاران، یەکێک لە ئەرکەکانی ئەم کۆمپانیایە

ئەوەیە کە بە کۆمپانیایەک بناسرێت کە گرنگی بە کڕیارەکانی بدات. ئەم ئەرکە کە بێگومان ئامانجێکی چۆنایەتی لەخۆدەگرێت نەک چەندایەتی، پاڵنەرێکە بۆ هەموو کارمەندان لە هەموو ئاستەکانی کۆمپانیاکەدا چونکە هەمیشە ئەم ئامانجەیان لەبەرچاوە، پێیان وایە باشترینن و کەس ناتوانێت بەقەد کۆمپانیای IBM خزمەت بە کڕیارەکان بکات .. ئاگاداری خۆت بە هەر کارمەندێکی ئەم کۆمپانیایە کارەکانی خۆی دەزانێت و ئەم کارە بە جۆرێک پەیوەندی بە گرنگیدان بە کڕیارەکانەوە هەیە. ئەمە یەکگرتوویی هەمووانە لە دەوری هۆکاری هاوبەش.

بەزۆری ئەرکی کۆمپانیایەک بە کورتی لە شێوەی پێناسەی ئەرکەکەیدا دەردەکەوێت. پێناسەی ئەرکەکە ڕستەی تایبەت و ڕوونی تێدایە کە بۆچی کۆمپانیاکە بوونی هەیە و ئامانج و ئامانجە سەرتاسەرییەکانی ڕوون دەکاتەوە، پێناسەی ئەرکەکە بە جۆرێک کڕیارەکانیش دەگرێتەوە. بۆ نموونە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە چۆن بەرهەمەکانئ یان خزمەتگوزارییەکانت ژیانی کڕیارەکان باشتر دەکەن.

چاد هێرلی دامەزرێنەری یوتیوب ویستی خەڵک بتوانن ڤیدیۆی خۆیان بخەنە سەر ئینتەرنێت، ئەرکی چارڵز شواب دروستکردنی قازانجترین و ئەخلاقیترین کۆمپانیای خزمەتگوزاری دارایی بوو. لاری پەیج و سێرگی برین دامەزرێنەرانی کۆمپانیای گووگڵ دەیانویست وێبگەردێی سادەتر بکەن.هوکاری دامەزراندنی کۆمپانیای ئیوە چیە؟

### ئامانجی بنەڕەتی لە هەر بزنسێکدا

وەک سەرکردەیەکی بزنس، پێویستە بزانیت کە تەنها یەک ئامانجی بنەڕەتی لەم کارەدا هەیە، ئەویش جگە لە بەدەستهێنانی کڕیار و خزمەتکردنیان هیچی تر نییە. سەرکردەکان هەمیشە کڕیارانی کۆمپانیاکەیان دەکەنە خاڵی سەرەکی سەرنجیان بۆ

نموونە، نموونەی کۆمپانیای Nerdstrom لەبەرچاو بگرن، سەرکردەکانی ئەم کۆمپانیایە بەردەوام شتەکان بۆ کڕیارەکانیان دەکەن، IBMهەمیشە بیر لە کڕیارەکانی دەکاتەوە و لایەنە جیاوازەکانی ئەمە دەکۆڵێتەوە، ئەمڕۆ زیاتر لە هەر کاتێک کۆمپانیاکان بیر لە کڕیارەکانیان دەکەنەوە دوای هەموو کارمەندانی ڕێکخراوەکە گەیشتوونەتە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کێ کڕیاری ئەوانە و لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە ئامانجی بنەڕەتی کۆمپانیاکە دابینکردنی پێداویستییەکانی کڕیارە بە باشترین شێوە، دروستکردنی یەکێتی و هاوئاهەنگی لەنێوان هەموو کارمەندەکاندا کارێکی زۆر سادەتر دەبێت.

. بە هەڵسەنگاندنێکی سادە دەتوانیت بزانیت کە ئایا ڕێکخراوێک بە باشی سەرکردایەتی دەکرێت یان نا، یەکەم: کاتێک لە ڕێکخراوێکدایت، سەرنج بدە و بزانە کارمەندانی ئەوێ چۆن باسی کڕیارەکانیان دەکەن، ڕێکخراوە باشەکان، کارمەندان هەمیشە بە ڕێزەوە باسی کڕیاران دەکەن. کارمەندانی ڕێکخراوە باشەکان هەمیشە بە شانازییەوە باسی کڕیاران دەکەن، وەک ئەوەی کڕیارەکان زۆر گرنگ بن بۆیان، کاتێک کڕیارێک پەیوەندی دەکات، وەک ئەوەی شتێکی گرنگ ڕوویدابێت.وە وەرزەکان، هەستێکی دڵخۆشی لەناو هەموو کارمەندەکاندا دروست دەبێت کاتێک کڕیارێک پەیوەندی دەکات و گوزارشتی لێدەکات ڕەزامەندی لە یەکێک لە بەرهەمەکان یان خزمەتگوزارییەکان، هەموو کارمەندان هەست بە شانازی دەکەن.

**کارمەندان چۆن باسی کڕیاران دەکەن لە ڕێکخراوەکەتدا؟**

گریمان تۆ بەڕێوەبەری یەکەیەکی ڕێکخراوێک بیت کە بەرپرسیارە لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بە یەکەیەکی تر لە هەمان ڕێکخراودا. لە ڕاستیدا

یەکەکەی تر وەک کڕیارەکەت دادەنرێت. هەرکەسێک بەرهەمەکەت لەبواری چالاکییەکانتدا بەکاربهێنێت بە کڕیاری تۆ دادەنرێت. سەرکردەکان دەبێت زۆر گرنگی بە دابینکردنی پێداویستییەکانی کڕیارەکانیان بدەن. ئەگەر بڕیارە ببیتە سەرکردەی ڕێکخراوێک یان یەکەیەکی ناو ڕێکخراوێک، سەرەتا پێویستە کاتت بۆ تەرخان بکەیت و بیر لە ئەرک یان ئامانجی گشتی ئەو ڕێکخراوە یان یەکەیە بکەیتەوە، دانانی ئەرکەکە بۆ ئەوەی باشترین بێت، پێویستە وەک یارمەتیدانی کەسانی تر سەیر بکرێت و گەیشتن بە ئاستە بەرزەکان لە سەرکردایەتیدا بزانیت.

## بەشی سێیەم

## پراگماتیزم

ئەگەر لێکۆڵینەوە لە ژیانی سەرکردە گەورەکانی وەک ناپلیۆن، ئەلێکساندەر، فلۆرانس نایتنگەیل یان دایکە تێرێزا بکەیت، ئەوا دەگەیتە ئەو ئەنجامەی کە هەموویان مرۆڤی زۆر چالاک بوون. خەیاڵاوی نەبوون و چاوەڕێی ئەوە نەبوون ئامانجەکانیان لەخۆوە بێتەدی کەی ئەوان گەیشتنە بیرۆکەیەک یان ئەرکێک، خۆیان بڕیاریان دا. دەستیان بە کار کرد و بە هەموو هێزی خۆیانەوە بەرەو ئامانجی دیاریکراو هەنگاویان ناوە. سەرکردەکان مرۆڤی داهێنەر و پێشکەوتنخوازن، هەرگیز کۆڵنادەن تا دۆخەکە خۆی ڕاست نەکرێتەوە. خێرا شکست دەهێنن، خێرا وانە لە شکستەکان وەردەگرن، دوای شکست دەچنە پێشەوە، سەرکردەکان هەرگیز کاتێکی زۆر بەسەر نابەن بۆ شیکردنەوەی دۆخەکە.

پێشەنگەکانی بازرگانی لە دونیای ئەمڕۆدا ئەم دروشمەیان بۆ خۆیان هەیە: "ئەنجامی بدە، چاکی بکەرەوە، تاقیبکەرەوە". ئەم دروشمە لە کتێبی "بە گەڕان بەدوای باشترین"ی تۆم پیتەر وەرگیراوە.

لەم کتێبەدا باس لەوە دەکات کە کۆمپانیا باڵاکان ئەوانەن کە زۆرترین هەوڵ دەدەن و زۆرترین ئەنجام دەهێنن. دواناخەن و چەند مانگ و ساڵ بەسەر دەبەن بۆ شیکردنەوە و پشکنینی هەموو لایەنەکان، لەبری ئەوە دەچنە سەر کاروبار و کارێک ئەنجام دەدەن . سەرکردە گەورەکان جەخت لەسەر هەنگاونان بۆ پێشەوە دەکەنەوە.

## چۆن هە ڵسوکە وتێکی خێرا ڕێگری لە زیانە کانی دوو ملیۆن دۆلار کرد

سە ڕکردە کان هە میشە پراگماتیکن و نە تە نیا کۆمپانیاکە یان بە ڕە و پێشە وە نابە ن، بە ڵکو خۆیان هە میشە چالاکن. ئەوەی ئەمڕۆ دەتوانیت بیکەیت بۆ سبەی دوا مەخە.

دواخستن پێچەوانەی پراگماتیزمە، سەرکردەکان دواناخەن چونکە ئەگەرنا بە هیچ شێوەیەک سەرکردە نەدەبوون. ئەمە وانەیەک بوو کە لە یەکەم ڕۆژەکانی کارەکەمدا فێری بووم. لەو ماوەیەی کە لە کۆمپانیایەکی گەورەدا کارم دەکرد، ڕۆژێک سەرۆکەکەم داوای لێکردم گەشت بکەم بۆ شاری ڕینۆ بۆ تەواوکردنی کارە کۆتاییەکان بۆ ئەوەی دەست بە دروستکردنی کۆمپلێکسێک لەسەر موڵکێک بە بەهای دوو ملیۆن دۆلار کە کۆمپانیاکە کڕیبووی . پێی وتم کە دەتوانم لە ماوەی دوو هەفتەی داهاتوودا ئەنجامی بدەم . من لەو کاتەدا سەرۆکی ئەو کۆمپانیایە نەبووم، بەڵام بەو پێیەی هەرگیز هیچ شتێکم دوا نەخستووە، بڕیارمدا ڕۆژی دواتر بچمە ئەوێ. هەر کە گەیشتمە ویلایەتی نیڤادا و لەگەڵ ئەو کەسانە کۆبوومەوە کە بڕیار بوو پڕۆژەکە جێبەجێ بکەن، لەنێویاندا ئەندازیارانی پڕۆژەکە، هەستم کرد کە کێشەیەکی جددی لە زەویەکەدا هەیە، لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا تەنها چەند کەسێک چەند کاتژمێرێک پێش ئەوەی گرێبەستی کڕینەکە کۆتایی پێبێت، کێشەکە ئەوە بوو کە ئەو پارچە زەوییە دەستی بە سەرچاوەی ئاو نەدەگەیشت و لە ڕاستیدا مەحاڵ بوو بە هیچ شێوەیەک ساخت و سازی لەسەر بکرێت.لە ڕاستیدا بە خێرای گەیشتن بە کارەکەم توانیم ڕێگری لەو کۆمپانیایە بکەم کە دوو ملیۆن دۆلار زیانی پێ بگات بۆ کڕینی پارچە

زەوییەکی بەکارنەهێنراو، سەرۆکەکەم زۆر دڵخۆش بوو بەم ڕووداوە، و لە ماوەی ساڵێکدا پێگەی ڕێکخراوەییم بەشێوەیەکی بەرچاو بەرزکرایەوە و من بووم بە بەڕێوەبەری سێ یەکە لەگەڵ 42 ستافی کارمەند دەستنیشانکرام.

**بیرکردنەوەیەکی ئایندەئاڕاستەکراوت هەبێت**

سەرکردەکان بیرکردنەوەیەکی ئایندە ئاڕاستەیان هەیە، زۆربەی سەرکردەکان لە داهاتوودا دەژین، بەردەوام بیرکردنەوەکانیان لەسەر داهاتوو چڕ دەکەنەوە، بیر لە تایبەتمەندییەکانی داهاتووی خوازراو و ڕێگاکانی بەدەستهێنانی دەکەنەوە، زۆربەی ئەو کەسانەی کە واشن نەک سەرکردەکان سەرنجیان لەسەر کات بێت، وازهێنان لە ئێستا و ڕابردوو، بیرکردنەوەی داهاتوو بە واتای پێکهێنانی کۆمەڵێک ئامانج و تەرکیزکردنی هەموو ڕۆژێک بۆ هەنگاونان بەرەو ئەوان. سەرکردەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان حەوت هەنگاوی سەرەکی دەگرنەبەر، ئەم حەوت هەنگاوە گرنگە بەم شێوەیەن :

**1- ئامانجە سەرەکییەکانت دەستنیشان بکە:** سەرەتا ئەو ئامانجانە دەستنیشان بکە کە دەتەوێت لە ژیانت یان پیشەکەتدا بەدەستی بهێنیت. ڕوونی و ڕوونی ئامانجە دیاریکراوەکان وشەی یەکەمە لەم بابەتەدا.

**-2 هەموو وردەکارییەکان بنووسە:** وردەکاری ئامانجەکانت دیاری بکە. ئامانجەکان دەبێت بتوانرێت هەڵبسەنگێرێت. بۆ نموونە ڕەنگە ئامانجت ئەوە بێت کە لە دوو ساڵی داهاتوودا فرۆشەکانت دوو هێندە بکەیت. پێویستە ئامانجەکانت بنووسیت، تا ئەو کاتەی نەنووسرێن، ئامانجەکان وەک فانتازیایەکی ناڕوون دەمێننەوە.

**3 - دیاریکردنی وادەیەک بۆ گەیشتن بەو ئامانجە:** ئەگەر ئامانجەکەت گەورە بوو، پێویستە بیکەیتە بەشە جیاوازەکان و وادەیەک بۆ هەریەکێک لە ئامانجەکانی ژێرەوەی دابنێیت.ئەو ئامانجانەی وادەی دیاریکراویان هەیە، دوو هێندە بەهێزترمان دەکەن، وادەیەک بۆ خۆت دابنێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت.

**-4-** لیستێک بۆ هەموو ئەو کارانە دروست بکە کە پێویستە بیکەیت بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەکەت، هەمەلایەنە بە بۆ ئەوەی بتوانیت بیر لە شتی جۆراوجۆری پەیوەندیدار بکەیتەوە و هەموو ئەو شتانەی کە دێتە مێشکتەوە لەم لیستەدا بنووسە بۆ ئەوەی دواجار تەواو بێت.

**5- دانانی پلانی کار:** لەم قۆناغەدا پێویستە لیستەکەت بکەیتە پلانێک کە هەنگاوی دیاریکراوی تێدابێت. لەمەدا دوو شت گرنگە، یەکێکیان ئەولەویەت و ئەوی دیکەیان ڕێکخستنە. کام بابەتی ناو لیستەکە زۆرترین ئەولەویەتیان هەیە، کامیان دەبێت سەرەتا بکرێت؟ لە کاتی دانانی ئەولەویەتەکان یاسای 20/80 لەبەرچاو بگرە، 20%ی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەیت 80%ی ئەنجامی کۆتایی دەهێنێت، بە دڵنیاییەوە ناتەوێت کاتەکانت بۆ شتە ناگرنگەکان بەسەر بەریت، هەروەها کارمەندەکانت ناوێت بۆ ئەوەی کاتەکانیان بەفیڕۆ بدەن.کەمتر شتە گرنگەکان بەسەر بەرن.ئەو شتانە دەستنیشان بکە کە یارمەتی تۆ و ڕێکخراوەکەت دەدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت. دوای ئەوە کاتی ئەوە هاتووە ڕێکوپێکی ئەنجامدانی کارەکان دیاری بکرێت. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە پێشمەرجەکان بۆ هەریەکێک لە بابەتەکانی ناو لیستەکە دیاری بکەیت. لە هەموو بەرنامەیەکدا شتگەلێک هەن کە بەپێی تەواوبوونی شتەکانی تر دەست پێدەکەن. هەروەها ئەو سنووردارکردنانە یان ئاستەنگانە دەستنیشان بکە کە لە ڕێگاکەتدا هەن، دانانی ئەولەویەتەکان لێرەدا زۆر گرنگە، گرنگترین ئاستەنگەکانت چین؟ ئەو کێشانەی کە دەبێت چارەسەر بکرێن. ئەوانە چین کە دەبێت بەسەریاندا زاڵ بن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت؟

**6 - دەست بە کارەکەت بکە:** ئێستا کە پلانێکت بۆ خۆت ئامادە کردووە و ئاشنای ئەو ڕێگایەی کە لە پێشتدایە، پێویستە دەستبەجێ دەست بە کار بکەیت.نابێت لەم نێوەندەدا دوودڵ بیت، هۆکاری شکستی زۆر کەس بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کار ناکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان و جێبەجێکردنی پلانەکانیان، لە هەر حاڵەتێکدا سەرکردەکان هەڵەیەکی لەو شێوەیە ناکەن.

**-7- هەموو ڕۆژێک کارێک ئەنجام بدە:** کاتێک تۆبەیانیان لە خەو هەڵسدەستی، پلان دابنێ خۆت بۆ ڕۆژەکەت ئامادە بکە، پاشان شتێک بکە کە بەرەو گەیشتن بە ئامانجەکانت بجوڵێت، پیتەر دروکەر لە کتێبێکدا نووسیویەتی کاری سەرکردە بیرکردنەوە لە داهاتووە، کەسی تر ئەو توانایەی نییە. مایکل کۆمی کە پلاندانەرێکی ستراتیژییە، دەڵێت "ئەوانەی ناتوانن بیر لە داهاتوو بکەنەوە، ناتوانن بەدەستی بهێنن" ئەلیک مەکێنزی (نووسەر و شارەزای بەڕێوەبردن) دەڵێت: باشترین ڕێگە بۆ پێشبینیکردنی داهاتوو دروستکردنیە.سەرکردەکان بە ئامانجەکانی دیاریکردن و هەنگاو بە هەنگاو بەرەو ئەوان و هەموو ڕۆژێک داهاتوو بنیات بنێن.

## وەرزی چوارەم

### بوێری

ئازایەتی یەکێکە لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی سەرکردایەتی. ئازایەتی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرکردەکان پێشەنگ بن و هەروەها ئەوانی تریش بەدەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە و شوێنیان بکەون، ڕەنگە بۆ زۆر کەس جێگەی سەرسوڕمان بێت کە ئازایەتیش لە ڕاستیدا بەهێزتر بێت. بوێری زگماکی نییە و دەتوانرێت فێری بێت.

بوێری خوو و عادەتە. هەروەک خووەکانی تر، بە پراکتیزەکردن و دووبارەکردنەوە، ئازایەتی بەهێزتر دەبێت. هەرکات بینیتان لەبەردەم (ئاڵنگاریەکان )تەحەددیاتەکاندا وەستان و دوورکەوتنەوە لە ڕووبەڕووبوونەوەیان، خۆت ناچار بکە بچیتە پێشەوە و ڕووبەڕوویان ببیتەوە، هەمیشە بەرەو ئەو شتانە هەنگاو بنێ کە لێی دەترسی. دورەپەرێزی لە ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ ئەو کارانەی کە لێیان دەترسی دەبنە هۆی دروست بوونی خوی ترسنۆکی و خووی ترسنۆکی بەهێزتر دەکەن . پێویستە لە بەرامبەردا بە پێچەوانەی ئەم ڕێگایە هەنگاو بنێی .پێویستە ڕاهاتیت لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو شتانەی کە لێیان دەترسی یان ئەو کەس و بارودۆخانەی کە لێیان دەترسیت ،ئێتر ترس لێت دەرەوێتەوە.

یەکێک لە ڕێگاکان بۆ بەهێزکردنی بوێری ، نەترسان لەوکارانەی لەپێشتن و بەبێ باکانە بچیتە پێشەوە.ئەم ڕستەیەم زۆر خۆشدەوێت کە دەڵێ : ((ترس مەخە دڵتەوە ،بە بێ باکی بچۆ پێشەوە تاکوو هێزی نەبینراو یارمەتیت بدات.)) من زۆر ژن و پیاوم ناسیوە کە سەرکەوتنی گەورەیان لە بازرگانیدا بەدەستهێناوە بە بەهرە و سەرچاوەیەکی سنووردارەوە.بەڵام لە هەمان کاتدا توانای ئەوەیان هەبوو کە هەریەک لەو دەرفەتانەی کە سەریان هەڵدا، بقۆزنەوە. ئەگەر بەردەوام بەرەو پێشەوە بچیت، وردە وردە شتەکان لە بەرژەوەندی تۆدا دەگۆڕدرێن. هێزی مرۆڤ و هەلومەرجەکان شانبەشانی یەکتر دەڕۆن و یارمەتیت دەدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت بە شێوەیەک کە تەنانەت بیریشی لێ ناکەیتەوە، بۆیە بوێری و چاونەترس بە. سەرکردەکان چاوەڕێی کەسانی تر ناکەن کارەکە ئەنجام بدەن. تۆ ناتوانی فەرماندەیەک بە خەیاڵتدا بێت کە چاوەڕێی دوژمن بکات تا کەی و لە کوێ هێرش بکات. سەرکردەکان ،تێڕوانینی هێرشکرنی پێشەنگییان هەیە.

یەکێک لەو فەرماندانەی کە ژیاننامەکەیم خوێندووەتەوە، فرێدریکی گەورە بووە. فەرمانڕەوایی پرۆسیا (ناوچەیەک لە ئەوروپای ڕۆژئاوا)ی دەکرد. لە نێو ئەو کەم کەسانەدا بوو کە لە ماوەی ژیانیدا نازناوی "گەورە"یان بۆ بەکارهێنا. هەرکاتێک ڕووبەڕووی دوژمنێک دەبوویەوە، هێرشی دەکردە سەری بەبێ گوێدانە قەبارەی هێزەکانی دوژمن، ئەگەر تۆ دوژمنی فرێدریک بوویتایە و ڕووبەڕووی بوویتەوە، بێ گومان هێرشی دەکردە سەرت، ئەگەر ئەو تەنها دە هەزار سەربازی هەبوایە و تۆش ٧٠ هەزار سەربازت هەبوایە دیسانیش هێرشی دەکردە سەرت، دروشمەکەی ئەوە بوو: ((نەترسی! چاونەترسی! و هەمیشە چاونەترسی!))

بێگومان لە زۆر شەڕدا دۆڕا، بەڵام لە شەڕە گرنگ و چارەنووسسازەکاندا سەرکەوت و بەم شێوەیە بوو بە یەکێک لە دەسەڵاتدارە بەهێزەکانی سەردەمی خۆی.

بەم شێوەیە فەرمانڕەواکانی ناوچەکانی دیکە دەیانزانی کە ئەگەر هێرش بکەنە سەر پرۆسیا، بێ گومان ڕووبەڕووی کاردانەوەی خێرای فرێدریک دەبنەوە.

**لەسەر ڕێڕەوی خۆی بمێنەرەوە**

تایبەتمەندییەکی دیکەی پەیوەست بە بوێری پێویستە لە سەقامگیری هەنگاوەکە و توانای بەردەوامبوون لەسەر ڕێگاکەدا لەبەرچاو بگیرێت، ئەم تایبەتمەندییە بەزۆری پێی دەوترێت سەبر و سەبرێکی بوێرانە، مارگریت تاچەر، سەرۆکوەزیرانی پێشووی بەریتانیا، بەم تایبەتمەندییە بەناوبانگ بوو، گرنگ نییە دۆخەکە چەندە سەختە و چەندە فشار و تۆ ڕووبەڕووی گرژی دەبیتەوە، دەبێت لەسەر ڕێڕەو بمێنیتەوە و بەردەوام بیت لە جوڵە. هەندێک جار، ئەگەر بەپێی پێویست لەسەر ڕێڕەو بمێنیتەوە و بەرگری نیشان بدەیت، دواجار خۆر لە هەورەکانەوە دێتە دەرەوە و دواجار ئامانجەکانت بەدەستت دەهێنیت.

لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، کاتێک هەمووان پێیان وابوو ئەڵمانیا شکست بە هێزەکانی بەریتانیا دەهێنێت و دەست بەسەر وڵاتدا دەگرێت، وینستن چەرچڵ وتارە بەناوبانگەکەی پێشکەش کرد و ڕایگەیاند کە "هەرگیز تەسلیم نابین"، دواتر چەرچڵ ئەم قسانەی بوێرانەی گوت، ئاشکرای کرد کە زۆر کەس دەیانەوێت چەرچڵ بە شێوەیەکی تایبەت هۆکاری بەرخۆدانەکەی بەم شێوەیە دەربڕی: "مێژووم خوێندووەتەوە و مێژوو دەڵێت ئەگەر بە ڕادەیەکی پێویست بەرەنگاری ببیتەوە، دواجار شتێک ڕوودەدات. ئەو ڕاستی دەکرد. " کەمتر لە مانگێک دوای ئەم لێدوانە تایبەتانە لەلایەن چەرچڵەوە، ژاپۆن بۆردومانی بەندەری پیرڵ هاربەری لە ئەمریکا کرد و ئەڵمانیا شەڕی دژی ئەمریکا ڕاگەیاند. بەم شێوەیە گەورەترین هێزی

پیشەسازی لە جیهاندا پەیوەندی بە هێزەکانی هاوپەیمانانەوە کرد و بە سەرکردایەتی چەرچڵ لە تەنیشت ئینگلتەرا دانرا.

**ئازایەتیت هەبێت بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بچیت**

لەبیرت بێت داهاتوو هی ئەو کەسانەیە کە ڕیسک دەکەن، هیچ گەرەنتییەک نییە کە ئەوانەی لە ڕیسک کردن دەترسن سەرکەوتوو بن.

بێگومان ئەمە بەو مانایە نییە کە ژیانت و هەموو ئەو شتانەی کە هەتە بخەیتە مەترسییەوە بۆ ئەم ریسکە. تەنیا بە مانای قبوڵکردنی مەترسییەکی حیسابکراو و مەعقولە لە ڕێگەی هەنگاونان بەرەو پێشەوە. خراپترین دەرئەنجامە ئەگەرییەکان لەبەرچاو بگرن و هەموو شتێک بکەن کە لە تواناتاندایە بۆ کەمکردنەوەی مەترسییە ئەگەرییەکان و دواتر ورە بە خۆت بدە بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بچی. ڕەنگە جیاوازی سەرەکی نێوان سەرکردە و غەیرە سەرکردە، خواست و بوێری پێشکەوتن و هەنگاونان بەرەو پێشەوە بێت.

# بەشی پێنجەم

## سەرکردەکان ستراتیژییەکان دادەڕێژن

سەرکردە و پلاندانەر و ستراتیژیستێکی زۆر باشن. دیسانەوە لە لێکۆڵینەوە لە ژیانی ژن و پیاوە سەرکەوتووەکان لە چالاکییە ئابوورییەکان و کارکردن شانبەشانی ئەوان، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەموویان پلاندانەرێکی نایاب و سەرنجڕاکێشن. ئەوان کاتێکی پێویست تەرخان دەکەن بۆ فێربوونی شێوازی دروستی بیرکردنەوەی ستراتیژی - بیرکردنەوەی ستراتیژی واتە گرتنەبەری دیدێکی درێژخایەن.
بیرکردنەوەی ستراتیژی وەک جۆرێک لە بیرکردنەوەی هەمەلایەنە هەژمار دەکرێت. سەرکردەکان هەموو لایەنەکانی ئەو کارانە لەبەرچاو دەگرن کە دەیکەن و هەموو ئەو شتانەی کە دەتوانن کاریگەرییان هەبێت، خۆیان وەک بەشێک لە جیهانێکی گەورەتر دەبینن. سەرکردەکان هەمیشە لە خۆیان دەپرسن "ئەگەر ئێمە ئەمەمان کرد، ڕەنگە چی ڕووبدات؟" دۆست و دوژمنەکانم چۆن کاردانەوەیان دەبێت بەرامبەر بەو بوارە کێبڕکێیەی کە ئێمە تێیدا ئامادەین؟ بازاڕ چ ڕێبازێک بەرامبەر بەو شتە دەگرێتەبەر؟"

### دەکرێت چی ڕووبدات؟

سەرکردەکان شارەزان لەوەی کە من پێی دەڵێم بیرکردنەوەی دەرهاویشتە.
بیرکردنەوەی دەرهاویشتە واتە دەتوانن بە وردی پێشبینی ئەوە بکەن کە لە داهاتوودا چی ڕوودەدات بە پشتبەستن بە ڕووداوەکانی ئەمڕۆ،.کڕیارەکان لە داهاتوودا دەیکڕن یان پێویستیان پێیەتی، ئەوان دەستنیشان دەکەن. بەڵام هەمیشە دەپرسن(( چی دەتوانێت ڕووبدات؟ چی ڕوودەدات کە هەڕەشە لە کارەکەم بکات؟)) بیرکردنەوەی

چارەسەر-ئاراستەکراو هەمان بیرکردنەوەی دەرهاویشتەیە . بیرکردنەوەی چارەسەرئاراستە بەو مانایەیە کە دەبێت داهاتوو خەیاڵ بکەیت، پاشان پێش ئەوەی ئەنجامی بدەیت، دەرئەنجام و دەرئەنجامە ئەگەرییەکانی ئەو کارانە لەبەرچاو بگرێت کە دەتەوێت بیکەیت. زانراوە کە ناپلیۆن لە چادرە فەرماندەییەکەیدا لە شەڕەکاندا دوژمنەکانی دەشکاند، پێداچوونەوەی بە نەخشەی ناوچەکە و پلانی جەنگی خۆیدا دەکرد، پاشان هەموو ئەو بارودۆخانە دیاری دەکرد کە ڕەنگە ڕووداوێکی نەخوازراو تێیدا ڕووبدات، دواتر بە باشترین ڕێگایی تاوتوێ دەکرد بۆ مامەڵە لەگەڵ هەریەکەیان .هەرکاتێک لە ناوەڕاستی شەڕدا شتەکان پێچەوانەی خواستی ئەو دەڕۆیشتن، بەهۆی ئەم لێکۆڵینەوە هەمەلایەنەیە دەیزانی چی بکات و بەخێرایی دەیتوانی وەڵامی ڕووداوەکە بداتەوە. ئەو کەسانەی کە بیرکردنەوەی ستراتیژییان هەیە، سوودێکی ئاشکرایان هەیە بە بەراورد بەو کەسانەی کە پێش جێبەجێکردنیان کاتیان بۆ لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە لە بابەتەکاندا تەرخان نەکردووە.

**پلانێکی ستراتیژی دابڕێژە**

سەرکردەکان دەبێت پلانێکی ستراتیژییان هەبێت بۆ ڕێکخراوەکەیان، بۆ داڕشتنی پلانێکی ستراتیژی کاریگەر دەبێت وەڵامی شەش پرسیاری گرنگ بدەیتەوە.

**1 ئێستا لە کوێی؟** لە هەنگاوی یەکەمدا هەموو پلانە ستراتیژییەکان مامەڵە لەگەڵ هەڵسەنگاندنی تەواوەتی دۆخی ئێستای کۆمپانیاکە دەکەن. ئەگەر بە باشی ئاشنا نەبوویت بە دۆخی ئێستای کۆمپانیاکە، ئەوا ناتوانیت هەنگاوەکانی داهاتوو بزانیت بۆ گەیشتن بە ئامانجە ستراتیژییەکان. وریابە لە دیاریکردنی پێگەی ئێستا، بۆ هەر بەشێکی کارا لە بواری بەرهەمدا، بڕەکەی لە فرۆشتنی قازانج، سەرمایەی پێویست، ڕێکارەکان، و پێگەی کێبڕکێی هەبوو پێویستە لەبەرچاو بگیرێت.

**-2- چۆن گەیشتیتە ئەو پۆستەی ئەمڕۆ؟** لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا تەنها ڕاستییەکان لەبەرچاو بگرە، کام بڕیار وای لێکردیت بگەیتە ئەو پێگەی ئێستا؟ کام لەو چالاکییانەی کە ئەنجامی دەدەیت گرنگە بۆ پاراستنی سەرکەوتنی ئێستات؟ کام چالاکییەکان بەس نین بۆ ڕاکێشان و مانەوەی کڕیارە دڵسۆزەکان بۆ کۆمپانیاکە؟ کام چالاکییەکانی ئێستا کە کۆمپانیاکە ئەنجامی دەدات دەتوانرێت بدرێتە دەرەوە؟

**3- دەتەوێت بگەیتە کوێ؟** دوای دیاریکردنی پێگەی ئێستا و هۆکارەکانی گەیشتن پێی لە هەنگاوی یەکەم و دووەم پێویستە پێگەی ئێستات دەستنیشان بکەیت، گرنگی بە هەموو وردەکارییەکان بدە، بۆ نمونە ئەو بەرهەمانەی دەیفرۆشیت بە کڕیارە سەرەکییەکانت و هەروەها ئەو ئەنجامە داراییانەی کە دەتەوێت ، بە شێوەیەکی ئایدیاڵ لە ماوەی پێنج ساڵدا دیاری بکە کە ساڵی داهاتوو چی بەدەست بهێنیت.

**-4- چۆن دەتوانیت لەو پۆستەی ئێستاوە بگەیتە ئەو پۆستەی کە دەتەوێت؟**
لیستێک بۆ هەموو ئەو کارانە دروست بکە کە پێویستە بیکەیت بۆ ئەوەی بگەیتە ئەو دۆخە ئایدیاڵەی لە هەنگاوی پێشوودا کێشاوتە، هەرکاتێک ئەرکێکی نوێت بینی کە دەتوانێت یارمەتیت بدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت، ئەوا زیاد بکە بۆ ئەم لیستە.

**5 بۆ گەیشتن بە ئامانجە ستراتیژییەکانتان دەبێت چ ئاستەنگێک تێپەڕێنن؟**
سنووردارکردن و ئاستەنگ هەیە کە ڕێگریت لێدەکات بۆ گەیشتن بەو دۆخە ئایدیاڵەی کە باست کرد بۆ بەشداریکردن لە پلانی ستراتیژی خۆتدا.ئەم ئاستەنگ و فاکتەرانە چین و چۆن دەبێت لێیان نزیک ببیتەوە؟

**-6 - چ زانیاری و سەرچاوەیەکی تر پێویستە بۆ گەیشتن بە ئامانجە ستراتیژییەکانتان؟** هەمیشە لێهاتوویی گرنگی نوێ هەیە کە پێویستە فێری ببیت یان بەهێزی بکەیت بۆ ئەوەی کڕیارەکانت بهێڵیتەوە بۆ ئەوەی لە ڕکابەرەکانت تێپەڕیت،

بۆ نموونە زۆرێک لە کۆمپانیاکانی ئەمڕۆ شارەزای سۆشیال میدیایان هەیە لەنێو کارمەندەکانیاندا.

**پلاندانانی سیناریۆ**

پلاندانانی سیناریۆ یەکێکە لە باشترین ئامرازەکان کە سەرکردەکان هەیانە بۆ ئامادەکردنی پلانی ستراتیژی. ئەم پرۆسەیە بریتییە لە داڕشتنی سێ یان چوار سیناریۆی تەواو ورد کە کۆمپانیاکەتان و ژینگەی بازرگانیت لە پێنج، دە یان بیست ساڵی داهاتوودا نیشان دەدەن. ئەم سیناریۆیانە پێویستە ئەو تایبەتمەندیانە لەخۆ بگرن وردەکارییەکان دەربارەی ئەو بەرهەمانەی کە دەیفرۆشیت و کڕیار و ڕکابەرەکانت کێن و چۆن جیاوازیەکیان هەیە لە ئەمڕۆ. هەروەها پێویستە وردەکارییەکان سەبارەت بەوەی کە هۆکارە ژینگەییەکانی وەک یاسا و ڕێساکان چۆن کاریگەرییان لەسەر کارەکەت دەبێت لە هەریەکێک لەم سیناریۆیانەدا جێگیر بکرێت . کاتێک سیناریۆی داهاتووتان ئامادە کرد، پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوو و هەنگاوە پێویستەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیناریۆیانە بهاوێژی . ئەگەرسیناریۆیەکی ڕاستی دەریدەخات کە یەکێک لە ڕکابەرەکانت بەرهەمێکی هاوشێوەی پێشکەش دەکات بە نرخێکی کەمتر، چی بکەیت بۆ ڕێگریکردن لەم دۆخە؟

**چڕبوونەوەی هێزەکان**

پشکنینی خاڵە بەهێزەکانت هەروەها کارمەندان و ڕێکخراوەکەت و تەرکیزکردنیان لەسەر ئەو بوارانەی کە دەتوانن بەرهەمدار بن، یەکێکە لە لایەنە سەرەکییەکانی ستراتیژییەکی باش، و بەم شێوەیە دەتوانیت هێزەکەت چڕ بکەیتەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکە. هەروەها دەتوانیت هێزی خۆت لەسەر لاوازییەکانی ڕکابەرەکان یان کەسانی دیکە لە بازاڕدا چڕ بکەیتەوە.

ڕکابەری تەواو لەگەڵ ڕکابەرەکانی تر لەو بوارانەی کە هەردووکتان بەهێزن بێمانایە، بەڵکو هەمیشە دەرفەت هەیە بۆ هەموو کۆمپانیایەک لە بازاڕدا کە تێیدا بتوانێت تایبەتمەندییە ناوازەکانی خۆی پیشان بدات و بەرهەم یان خزمەتگوزاری جیاواز پێشکەش بکات.بەم شێوەیە، لە بەشێک لە بازاردا کە ڕەقیبەکان تێیدا قسەیەکی ئەوتۆیان نیە بۆ وتن ئامادەییەکی بەهێزیان هەبێت. ڕاستە پێویستە هەموو هەوڵەکانت چڕ بکەیتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا، پێویستە سەرنجی ئەو بوارانەش بدەیت کە لە ڕووی کێبڕکێیەوە لاوازیت و بیر لە خراپترین دەرئەنجام بکەیتەوە. خراپترین بەربەست چییە کە دەتوانێت بەسەرتدا بێت؟ خراپترین دەرئەنجام چییە کە دەتوانێت لە بازاڕدا ڕووبدات بۆ ڕێژەی سوودی بانکی، کارمەندانی ژینگەی کێبڕکێ و هتد؟ بە وردی پێداچوونەوە بە هەموو ئەم سیناریۆیانەدا بکە بۆ ئەوەی پلانی تایبەتت هەبێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا ئەگەر بازاڕ بەربەستێک فڕێ بداتە بەردەمت.

سەرکردەکان و پلاندانەرانی ستراتیژی توانای کاردانەوەی خێرایان هەیە، چونکە پێشوەختە بیر لەوە دەکەنەوە کە ڕەنگە چی ڕووبدات. بە ڕووداوی تاڵ و چاوەڕوان نەکراو نالەرزن و پاشەکشە ناکەن، توانای شیکردنەوە و شیکردنەوەی وردی دۆخەکەیان هەیە، بڕیار دەدەن پارە و فەرمانبەران بگوازنەوە بۆ بەشێکی تر، لە هەندێک بواردا پاشەکشە بکەن و لە هەندێک بواردا پێشڕەوی بکەن. لە زۆرێک لەو حاڵەتانەی سەرەوەدا، توانای کاردانەوەی خێرایان بەرامبەر بە ڕووداوە ناخۆشەکان کە ئەمە نیشانەی سیفەتی سەرکردایەتی باڵایە.

## بەشی شەشەم

# توانای وروژاندن و پاڵنەر

مرۆڤێکی ئاسایی لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە کەمتر لە ٥٠٪ و هەندێک جار کەمتر لە ٤٠٪ دەسەڵات و توانای خۆی کار دەکات .سەرکردەکان بواری سوود وەرگرتنی کەسەکان لەم سی ، چل یان پەنجا لەسەدای بەکارنەهاتوو فەراهەم دەکەن ، ئەوان بە ئاراستەی پێشکێشکردنی کارکردێکی زیاتر لە ئاستی ئاساییەوە پاڵیان پێدەنێن.

### هۆکارە پاڵنەرەکان

لە هەنگاوی یەکەمدا پێویستە بزانیت چی پاڵنەری مرۆڤەکانە و لەڕاستیدا چی دەبێتە هۆی ئازادی، ٣٠ بۆ ٥٠٪ی توانا و دەسەڵات بەکارناهێنرێت. ئێمە شەش هۆکاری پاڵنانمان دەستنیشان کردوە کە دەتوانێت کەسێک دەتوانێت ببێتە بەکارکردی ئاسایی و کەسێکی تر بە کارکری ناوازە . یەکەم فاکتەری پاڵنەر ئەوەیە کە کارێکی تەحەدا و سەرنجڕاکێش بدەیت بەکەسەکان .لەم حاڵەتانەی کە کارمەندان ئارەزووی کارەکانیان

ناکەن، بەڕێوەبەران بەدوای هۆکاردا دەگەڕێن بۆ ئەوەی تاوانباریان بکەن، ئەوە پەیوەندی بە پێدانی شتێکەوە هەیە بۆ ئەوەی کەمێک قورستر پاڵ بە خۆیانەوە بنێن بۆ ئەنجامدانی. بەمەش پاڵیان پێدەنێتە دەرەوە لە ناوچەی ئاسوودەیی خۆیان و دەرفەتێکیان پێدەدرێت بۆ گەشەکردن.

دووەم فاکتەری پاڵنەری فەرمانبەران ئەگەری پەیوەندی ئاسان و ڕاستگۆیانە، سەرکردەکان هەمیشە ڕوونکردنەوە دەدەنە کارمەندەکانیان سەبارەت بەو ئەرکانەی پێیان دەسپێرن. زانینی ئەوەی کە ئەو کارانەی کە دەبێ ئەنجام بدرێت بەشێکە لە ئامانجێکی گەورەتر، پاڵنەر و ئیلهامبەخشە بۆ کارمەندان.

سێیەم فاکتەری پاڵنەر بریتییە لە پێدانی بەرپرسیارێتی تەواو لە ئەرکێکدا و لێپرسینەوە لە کەسەکە لەسەری. ئەگەر فەرمانبەران بە بەرپرسیار هەژمار بکرێن لەو ئەرکانەی کە ئەنجامی دەدەن، ئەگەری ڕاکێشانیان بۆ کارەکە زیاد دەکات، ئەمەش متمانە بەخۆبوون و خۆبەگەورەزانینیان زیاد دەکات. سەرکردەکان دەزانن چۆن پشتگیری کارمەندەکانیان بکەن لە هەمان کاتدا بەرپرسیارێتی تەواویان پێدەدەن لە هەندێک ئەرک و هەنگاونان بە لایەکدا.

فاکتەری چوارەم پاڵنەرە بۆ گەشەکردنی کەسیە. ئەگەر کارمەندان هەست بکەن کە لە کارامەییەکدا پێشدەکەون یان کارامەییەکی نوێ و گرنگ فێردەبن، ئەوا زیاتر پاڵنەریان دەبێت بۆ ئەوەی باشترینیان پێشکەش بکەن .

فاکتەری پاڵنەری پێنجەم و شەشەم ئەوەیە کە زۆر کەس بە فاکتەری یەکەم دەزانن و ئەویش پارە و سوودی کارە. پارە و سوودی کار پاڵنەرێکە بۆ خەڵک. بەڵام بە پێچەوانەی باوەڕی باو، ئەوان گرنگترین هۆکاری پاڵنەر نین.

## سێ پێویستی هەیەجانی

مرۆڤەکان سێ جۆر پێویستی هەیەجانییان هەیە. دابینکردنی ئەم پێداویستیانە و ئەو ڕەزامەندییەی بەدەست دێت مرۆڤەکان بە پاڵنەر دەهێڵێتەوە، پۆلی یەکەم پێویستی وابەستەییە. پێویستە مرۆڤەکان هەست بەوە بکەن کە بەشێکن لە شتێکی گەورەتر لە خۆیان و ئەم پێویستییە لەو ڕێکخراوانەدا دابین دەکرێت کە کارەکە ئەنجام دەدەن. بەردەوام جەخت لەسەر کارمەندەکانت بکەرەوە کە ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت زۆر بەنرخە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی کۆمپانیاکە.

پۆلی دووەم پێویستی سەربەخۆییە، لەم حاڵەتەدا فەرمانبەران دەیانەوێت سەرنجیان بدرێت بە دەستکەوت و تایبەتمەندی تاکەکەسی و ئەوەی وەک مرۆڤ دەیکەن لە گروپەکەدا. دەتوانیت هەموو دەرفەتێک بەکاربهێنیت بۆ بەهێزکردنی هەستی بەها بۆ هەریەک لە کارمەندەکانت.

جۆری سێیەمی پێداویستییەکان پێویستی هەیەجانیە بۆ وابەستەیی یەکتر. لە ڕاستیدا مرۆڤەکان دەیانەوێت هەست بە بەشێک لە تیمێک بکەن و هاوکاری کەسانی تر بکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش، باشترین سەرکردەکان بەردەوام بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی پەیوەندی کارکردنی نێوان کارمەندەکانیان بە بەرهەمدار و بەرهەمدار بمێنێتەوە، سەرکردەکان کە بتوانن هەموو ئەم پێداویستییە هەیەجانیە دابین بکەن .دابینکردنی کارمەندانی دڵخۆش و پاڵنەرێکی بەرز بۆ ئەوەی کاری قورس بکەن و بەشداری بکەن لە سەرکەوتنی کۆمپانیاکە.

### هونەری وەفدکردن

وەفدکردن ڕێگەیەکی گرنگە بۆ پاڵنەر و ئیلهامبەخشین بە کارمەندان، چونکە بەم شێوەیە خاوەندارێتی ئەرک و ئامانجی یەکەیەک یان کۆمپانیایەکیان پێدەدەین. ئێستا با هەندێک لە پێشمەرجەکانی وەفدکردن بکۆڵینەوە:

سەرەتا کەسێکی گونجاو هەڵبژێرە. ڕاسپاردنی ئەرکێک بە کەسێکی نەشیاو بە هەر هۆکارێک بێت بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی شکست. بەم شێوەیە لەبری ئەوەی کەسەکە پاڵنەر بێت، پاڵنەرەکەی کەم دەکەیتەوە. هەڵبژاردنی کەسی گونجاو مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ وەفدکردن.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە پێویستە مەرجەکانی کارەکە لەگەڵ تواناکانی کەسەکەدا بگونجێنیت. ئایا ئەو کەسەی بەدوایدا دەگەڕێیت توانا و ئەزموونی پێویستی هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە؟

سێیەم: پێویستە بە شێوەیەکی کاریگەر شتەکان بە کەسانی گونجاو بسپێریت. بزانە کام کارمەندی تر دەتوانێت ئەرکەکانت ئەنجام بدات بۆ ئەوەی بتوانیت کاتەکانت لەسەر ئەرکە بەها بەرزەکان چڕ بکەیتەوە بە تەرخانکردنی ئەم ئەرکانە بۆیان.

چوارەم: ئەرکی بچووکتر بۆ کارمەندانی نوێتر دیاری بکە. بەم شێوەیە دەرفەتێک بۆ خۆیان دەڕەخسێنن بۆ بەهێزکردنی متمانەی خۆیان و پەرەپێدانی تواناکانیان بۆ ئەنجامدانی ئەرکی گەورەتر.

پێنجەم: هەموو شتێک جێبهێڵە. پێدانی بەرپرسیارێتی تەواوی کارەکە بە خەڵک زۆر زیاتر پاڵنەریان دەبێت لەوەی کە تەنها بەشێک لە کارەکە پێیان بسپێردرێت.

شەشەم: بە شێوەیەکی شەفاف ئەنجامەکان ڕادەست بکەن. بە وردی بۆ خەڵک ڕوون بکەرەوە کە پێویستە چی بکرێت و پێوەرەکان دابنێ بۆ پێوانەکردن و هەڵسەنگاندنی ئەنجامی کۆتایی، ئەگەر نەتوانیت شتێک هەڵسەنگێنیت، ئەوا ناتوانیت بەڕێوەی بەریت.

لە کۆتاییدا ئەرکەکان بە بەشداری و دیالۆگ ڕاسپێردرێت. بەشداریکردن لە ڕادەستکردنی ئەرکێکدا زۆر پاڵنەرترە لەوەی کە ڕاستەوخۆ ئەرکێک یان بەرپرسیارێتییەک دەدەیت بە کەسێک. داوا لە خەڵک بکە پرسیار بکەن یان پێشنیار بکەن سەبارەت بەو کارەی کە بڕیارە بۆیان دیاری بکرێت. بەم شێوەیە هەستی خاوەندارێتییان لەگەڵ ڕێزگرتن لە ئەرکی دیاریکراودا زیاد دەکات.

لە کاتی ڕاسپاردنی ئەرکێکدا داوا لە کەسی ناوبراو بکە ئەو شتانەی کە داوای لێکردوویت بۆت دووبارە بکاتەوە، پێویستە ئەو کەسەی ئەرکەکە قبوڵ دەکات لەو وردەکاریانە تێگەیشتبێت کە تۆ دەتەوێت، هەرگیز ئەرکێک مەسپێنە بە کەسێک کە گرنگی پێنەدات، ٥٠٪ ئەو کەسەی کاری پێی دەسپێریت تێگەیشتنێکی هەڵەی دەبێت لە فەرمانەکانت و ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە پێویستە هەر لەوێدا بوەستێنرێت.لە ئەگەری پێویست قەڵەم و کاغەز بدە بە کەسێک تاوەکوو تێبینی بنوسێت.

**نمونەیەک بە بۆیان**

ڕێگەی تریش هەیە بۆ ئیلهامبەخشین و پاڵنەر بۆ کارمەندان. یەکێک لە ڕێگاکانی وروژاندنی حەماسەتیان ئەوەیە کە حەزیان زیاد بکەی .سەرکردەکان بە یەکێک لە ئەرکەکانی خۆیان دەزانن حەماسەتی فەرمانبەران بوروژێنن بۆ بەشداریکردن لە ئەنجامدانی کارەکاندا. کاتێک فرانسیس هێسلباین سەرکردایەتی کچە سکاوتەکانی گرتە ئەستۆ (ڕێکخراوێکی نیشتمانییە لە ئەمریکا کە خۆبەخشانی هەرزەکار بەکاردەهێنێت بۆ ئەنجامدانی کاری باش)، ڕێکخراوەکە خەریکی لێک هەڵوەشان بوو.بەڵام هێڵسباین دەیزانی کە خۆبەشەکانی ئامادەبوو لەو ڕێکخراوە بەدوای هۆکارێک بۆ هاندانی خۆیانن . ئەو وتی: (("بەهیچ شێوەیەک پرسی دروستکردنی حەماسەت لە نێوان مرۆڤەکاندا نییە؛ بەڵکو پرسی سەرەکی ئەوەیە کە سوود لەم حەماسەت و وزەی شاراوە و فراوانە وەربگرین کە مرۆڤەکان لە دڵ و مێشکیاندا هەیە بۆ خزمەتکردنی ئەوانی تر. ))هێلسباین ڕێگایەکی بۆ سوود وەرگرتن و

ئازادکردنی ئەو وزەیە دۆزیەوە و بەم شێوەیەش بۆ ئەو گۆڕانکارییەی کە لە ڕێکخراوی کچە سکاوتەکاندا دروستی کردبوو، سەرکەوتوو بوو لە وەرگرتنی مەدالیای ئازادی لە دەستی سەرۆکی ئەمریکا لەو کاتەدا.سەرکردەکان خۆیان هەروا کەسانی بە جۆش و خرۆش، و بەم شێوەیە، دەبنە هۆی حەماسەت لە نێوان ئەوانی تریشدا. پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان ئەو بڕە وروژاندن و حەماسەتەی کە هەتە بۆ ئەو کارەی کە دەیکەیت، لە لایەک و ئەو وروژاندن و حەماسەتەی کە دەتوانیت لە نێوان خۆتدا دروستی بکەیت ئەگەر تۆ جۆش و خرۆش و پاڵنەرێکی زۆرت هەبێت، کارمەندەکانت بەهەمان شێوە جۆش و خرۆش دەبن، بێگومان بڕی ئەم خولیایە کەمتر دەبێت لە خولیاکەت. ڕێگەیەکی دیکە بۆ ئیلهامبەخشین و زیادکردنی پاڵنەر لە کارمەنداندا ئاستی پابەندبوونی خۆتە. سەرکردەکان بە تەواوی و 100% پابەندن بە کارەکانیانەوە.

یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی سەرکردەکان ئەوەیە کە 100% پابەندن بە کارەکانیانەوە. ئاستی پابەندبوونت ئاستی پابەندبوونی کەسانی دەوروبەرت دیاری دەکات. هەروەها ئاستی پابەندبوونت بە کارکردن ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە دەگێڕێت لە ئاستی سەرنجی سەرووی خۆت لە ڕێکخراوەکەدا، چونکە ئەو کەسانەی پابەندبوونیان بەرزە هەمیشە بە بەها دادەنرێن بۆ ڕێکخراوەکان و لە پێشینەی کارەکانیان بۆ بەرزکردنەوەی کار، هەروەها ئەو کەسانەی خاوەندارێتی دەکەن ئەوان بۆیان دەردەکەوێت کە ئاستی حەماسەت و پابەندبوونیان بە کۆمپانیاکە و هەروەها ئەو بەرهەم و خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی دەکەن ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان هەیە لە پێشەنگایەتیکردنیان لە بواری چالاکییەکانیاندا.هەروەها سەرکردەکان کارمەندەکانیان بەهێزتر دەکەن بە ئیلهامبەخشین و هاندانی ئەوان. لە مێژوودا نووسراوە کە جۆرج واشنتۆن پێش جەنگ لە ناوچەی ڤالی فۆرج هانی سەربازەکانی دەدات، هەروەها ناپلیۆن لە کاتی جەنگەکاندا هانی سەربازەکانی دەدا، ئەسکەندەری مەکدۆنی پێش جەنگەکان لە ئۆردوگای پیاوەکانیدا ئامادە بووە و متمانەی بۆدەر دەربڕین. بەکورتی هاندان و ئیلهامبەخشین یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکانی ئیلهامبەخشین و پاڵنەری

کارمەندان. سەرکردەکان متمانە و متمانەی گەلەکەیان پتەوتر دەکەن، جێگای سەرسوڕمانە ئەگەر باوەڕمان بە سەرکردایەتی خۆمان و ئەو کەسانەی کە هەمانە، دەتوانین کارێک بکەین لە دەرەوەی خەیاڵمان، ئەگەر متمانەمان بەم کەسانە هەبێت ئەگەر کاڵ بووەوە، پاڵنەرەکەمانیش کەم دەبێتەوە.

لە کۆتاییدا سەرکردەکان هەستی دڵسۆزی بەهێز دەکەن و ئەوە دڵسۆزییە کە هەموو بەشەکانی ڕێکخراوێک بەیەکەوە دەبەستێتەوە، لە ڕاستیدا دڵسۆزی ڕۆڵێکی ژیانی و گرنگ دەگێڕێت لە سەرکەوتنی ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکاندا، سەرکردەکان وا لە خەڵک دەکەن وەک چەسپی دڵسۆز و پابەندبوون بە ڕێکخراوەکەوە .

# بەشی حەوتەم

## خۆت پابەند بکە بە بردنەوە

چۆن سەرکردەکان شوێنکەوتوبە دەست دێنن؟ چی توانای ئەوەی بە مرۆڤێکی ئاسایی دەبەخشێت کە لە ڕێگەی کەسانی ئاساییەوە کاری نائاسایی ئەنجام بدات؟ بۆچی خەڵک نازناوی سەرکردە بۆ هەندێک کەس بەکاردەهێنن؟ هەموو ئەمانە هۆکارێکی سادەیان هەیە: هەندێک کەس دەبنە سەرکردە، چونکە هەندێکی تر وەک شایستەترین کەس دەیانناسن بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە بەرەو سەرکەوتن ببەن، سەرکردایەتی یەکسانە بە بردنەوە و سەرکەوتن.

ئەرکی سەرەکی سەرکردە بەدەستهێنانی سەرکەوتنە. هەر بۆیە ئەو کۆمپانیایانە کە ئاستێکی دڵخۆشکەریان نییە یان کاتێک تیمێک ڕووبەڕووی شکستی یەک لە دوای یەک دەبێتەوە، یەکەم شت کە دەکرێت گۆڕینی بەڕێوەبەری جێبەجێکار یان ڕاهێنەرە و گۆڕینی کەسێکی ترە کە پێدەچێت بتوانێت ڕێکخراوەکە یان تیپەکە بەرەو سەرکەوتن ببات توانای بردنە پێشەوەی خەڵک بۆ سەرکەوتن و دامەزراندنی ئەو باوەڕە کە تیمەکەت دەتوانێت سەرکەوتن بەدەستبهێنێت ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت لە هێزی تۆ وەک سەرکردەیەک.

سەرکردەکان پابەندن بە سەرکردایەتی و کوالیتی چونکە سەرکردایەتی و کوالیتی لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی سەرکەوتن. کارمەندانی ڕێکخراوێک حەز دەکەن بە پێشکەشکردنی باشترین بەرهەم و خزمەتگوزاری لە بازاڕدا بناسرێن.کوالیتی و جۆری خزمەتگوزاری زۆر گرنگە، سەرکردەکان پێیان وایە کە ڕێکخراوەکەیان توانای پێویستی هەیە بۆ ئەوەی باشترین بن لە بواری چالاکییەکانیاندا، ئامانجی سەرکردەکان ئەوەیە کە ڕێکخراوەکەیان و تیمەکەیان بکەنە سەرکردە، ئەوان مەیلیان هەیە بۆ ئەوەی ئاسایی بن و هاوشێوەی ئەوانی تر، ئەوان هیچیان نییە و تەنها بیر لەوە دەکەنەوە کە باشترین بن، لە کۆتاییدا سەرکردەکان هەمیشە بیر لە سەرکەوتن دەکەنەوە .

هەمیشە بیر لە سەرکەوتن دەکەنەوە، لەم حاڵەتەدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. بۆ تۆ حەتمی دەبێت ئەگەر کارمەندانی ڕێکخراوەکەت بیر لە سەرکەوتن بکەنەوە و شتگەلێکی وەک زیادکردنی فرۆش و قازانج و کەمکردنەوەی تێچوون و پێشەنگی بازاڕ لەبەرچاو بگرن، ئەوانیش سەرکەوتوو دەبن.

## وانەی ستراتیژی سەربازی

سەرکردەیەکی سەربازی تەنها یەک ئامانجی هەیە و ئەویش سەرکەوتنە. هەروەها زۆرێک لە سەرکردەکانی چالاکییە ئابوورییەکان ئیلهامیان لە سەرکردە سەربازییەکان وەرگرتووە و هەندێک ستراتیژی سەربازی بەکاردەهێنن، لە کتێبەکەمدا بە ناونیشانی "سەرکەوتن" باسم لە بنەماکانی ستراتیژی سەربازی کردووە کە دەتوانێت ببێتە هۆی سەرکەوتن لە هەر بوارێکدا، با لە هەندێک لەو بنەمایانە بکۆڵینەوە:

**بنەمای ئامانج**

سەرکردە سەربازییەکان لە هەموو وردەکارییەکی ئامانجەکانی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانیان دەکۆڵنەوە. لەم بابەتەدا هیچ ناڕوونییەک نابێت. ئەم شەفافیەت و ڕوونی وردەکارییەکان بۆ چالاکییە ئابوورییەکانیش پێویستە. هەر یەکێک لە کارمەندەکانت دەبێت بزانن چی بکەن و وەک سەرباز لە بەرەکانی شەڕدا پابەندبن بە سەرکەوتن.

**بنەمای هێرش کردن**

ناپلیۆن وتی(( تا ئێستا کەس لە شەڕێکدا بە ڕێبازی بەرگریی سەرکەوتو نەبووە.)) سەرکردەکان ڕێبازێکی پاسیڤیان نییە. چاوەڕێ ناکەن بزانن چی ڕوودەدات، هەنگاو دەنێنە ناو دۆخەکەوە و کۆنترۆڵی دۆخەکە دەکەن.

**بنەمای چڕبوونەوەی هێزەکان**

ئەم پرەنسیپە گرنگی ناوەندگەرایی دەسەڵات نیشان دەدات. لەسەر بنەمای ئەم بنەمایە لە بازرگانیدا، پێویستە باشترین کارمەندەکانت و باشترین تواناکانت و هەموو ئەو سەرچاوانەی کە هەتە لەسەر ئەو شتانە چڕ بکەیتەوە کە زۆرترین ئەگەری بەدەستهێنانی سەرکەوتنیان هەیە. سەرکردە گۆڕانکارییەکان بەزۆری پێکهاتەی چالاکییەکان دەگۆڕن بۆ ئەوەی باشترین بەهرەمەندەکانی ناو ڕێکخراوەکە بەکاربهێنن و بەم شێوەیە زۆرترین ئەنجام بەدەستبهێنن کە کۆمپانیاکە دەتوانێت بەدەستیبهێنێت بۆ دەرچوون لە دۆخی نالەباری ئێستای.

## بنەمای غافلگیری

زۆربەی سەرکەوتنەکانی شەڕەکانی مێژوو بەهۆی ئەو فەرماندانەی کە دوژمنەکەیان تووشی غافلگیری کردووە و لە لاوە یان لە پشتەوە هێرشیان کردووەتە سەر دوژمنەکەیان. پرەنسیپی غافلگیری لە بواری چالاکییە ئابوورییەکان بە واتای داهێنان و نەرمی دێت، بۆ نموونە سوپرایز بۆ ڕێکخراوەکەت ڕەنگە بەم شێوەیە بە مانای ئەوەیە کە پێویستە پێچەوانەی ئەو کارە بکەیت کە دەیکەیت بۆ ئەوەی ڕێکخراوێکی ڕو لە دابەزین بگەیەنیت بە سەرکەوتن.

## بنەمای زانیاری

سەرکردەکان زانیاری کۆدەکەنەوە. ئەوان دەزانن کە زانیاری دەسەڵاتی لەگەڵە، هەموو ئەو زانیاریانە کۆبکەرەوە کە پێویستتانە بۆ بڕیاردانی دروست.

## بنەمای هەماهەنگی

سەرکەوتن کاتێک بەدەست دێت کە هەموو ئەندامانی تیپەکە ئامانج و بەهای هاوبەشیان هەبێت، هەمووان دەزانن ئەوی تر چی دەکات و بۆچی دەیکات، هەمووان پێیان وایە هەموو تیمەکە پابەندە بۆ گەیشتن بە یەک ئامانج.

## پرەنسیپی فەرماندەیی یەکگرتوو

لە هەموو ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیدا، تەنها یەک سەرکردە دەبێت ئامادەبێت. لە کۆتاییدا تەنها یەک کەس بەرپرسیار بێت لە سەرکەوتنی چالاکیەکە. ئەمەش ناوچە مەدەنییەکانیش دەگرێتەوە و گرنگتر دەبێت بە تایبەت لە ماوەی قەیرانەکاندا کە کاتێکی سنووردار لە نێوانیاندا هەیە. سەرکردەیەک لەم جۆرە بارودۆخانەدا بۆ هەمووان ڕوون دەکاتەوە کە خۆی بەرپرسیارە و تەنها خۆی فەرمانی پێویست دەدات.

# بەشی هەشتەم

## سەرکردە و توانای پەیوەندیکردن

سەرکردەکان زۆر بە شێوەیەکی کاریگەر پەیوەندی دەکەن. توانای پەیوەندیکردن یەکێکە لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی سەرکردایەتی چونکە ٨٥٪ سەرکەوتنی سەرکردە پەیوەستە بە پەیوەندی کاریگەرانەی لەگەڵ ئەوانی تردا. هەرچییەک بێت، سەرکردایەتی پێویستی بە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تر هەیە، سەرکەوتنی ئەوانی تریش مانای سەرکەوتنی سەرکردەیە، ئەگەر نەتوانی پەیوەندی بکەیت، ناتوانیت سەرکردە بیت. پەیوەندیکردن کارامەییەکە کە دەتوانرێت فێری بێت. یەکەم هەنگاو لەم ڕێگایەدا فێربوونی پێنج ئامانجە کە پێویستە لە ڕێگەی پەیوەندییەکانتەوە بەدەستی بهێنیت. ئەم پێنج ئامانجە بریتین لە:

١-دەبێت کەسانی تریش وەک خۆت و ڕێزت لێ بگرن، سەرکردایەتی بە مانای هاوڕێیەتی نییە، بەڵام ئەگەر ئەوانی تر حەزیان لێت بێت و ڕێزت لێ بگرن، ئەوان زیاتر ئامادە دەبن گوێ لە قسەکانت بگرن. 2- دەبێت وا لە کەسانی تر بکەیت بەها و گرنگی خۆت پشتڕاست بکەنەوە.مەبەست لەم کارە دروستکردنی کۆنتێکستە بۆ ئەوەی ئەوانی تر گوێ لە قسەکانت بگرن.

3 - دەبێت کارێک بکەیت بۆ ئەوەی کەسانی تر قەناعەت پێبکەیت بۆ ئەوەی دیدگاکەت قبوڵ بکەن.

ئه مرۆ سه ڕکردایه تی به واتای ڕازیکردنی خەڵکە نەوەک  فه ڕمانکردن به خه ڵک. ده بێت بتوانیت خه ڵکی تر ڕازی بکه یت بۆ ئه وه ی ڕوانگه ی خۆت له به ڕچاو بگرن و له گه ڵدا هاوڕا بن.

4 - دەبێت وا لە کەسانی تر بکەیت کە عەقڵیەتی خۆیان بگۆڕن و هاوکاریت بکەن. تۆ ناتوانی ببیتە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو ئەگەر ئەو کەسانەی کە هەتە بیر لە دژایەتی تۆ بکەنەوە یان هەڵوێست و بۆچوونەکانی پێشوویان نەگۆڕن، سەرکردەکان بەزۆری وا دەبن. ئەوان دەبنە هۆی گۆڕانکاری و کلیلی ئەنجامدانی گۆڕانکاریش لە پەیوەندییەکی کاریگەردایە.

5- پێویستە شتەکان ئەنجام بدەیت بۆ ئەوەی کاریگەرتر بن لە پەیوەندییەکانتان، سەرکردایەتیکردن دوو شتی گرنگ لەخۆدەگرێت، دەسەڵات و کاریگەری، و هەردوو ئەمانەش لەڕێگەی پەیوەندی کاریگەرەوە بەدەست دەهێنرێن.

### شەفافیەت دروست بکە

سەرکردەکان بۆچوون و ستراتیژ و دیدگاکانیان بە ڕوونی دیاری دەکەن. هەرکاتێک ڕێکخراوێک ببینیت کە کارێکی باشی ئەنجام نەدات، بۆت دەردەکەوێت کە تێگەیشتنێکی ناشەفاف لەنێو کارمەندەکانیدا هەیە سەبارەت بە هۆکارە بنەڕەتییەکانی بوونی ئەو ڕێکخراوە. لە ڕێکخراوێکی سەرکەوتوودا، کارمەندان لە هەموو ئاستەکاندا زۆر بە ڕوونی و بە وردی دەزانن کە هەوڵی چی دەدەن و بەرەو کوێ دەڕۆن و چ داهاتوویەک چاوەڕێیان دەکات. ئەوان باش ئاگاداری خاڵە بەهێز و لاوازەکانیانن. ئەگەر دەتەوێت ببیتە سەرکردەیەکی گەورە، پێویستە بۆچوون و بیرۆکە و ئامانجەکانت بە شێوەیەکی ڕوون و دیاریکراو بۆ کەسانی دیکە ڕوون

بکەیتەوە. هەروەها دڵنیابە لەوەی ئەو کەسانەی کە بڕیارە یارمەتیت بدەن بە تەواوی ئاشنان بەوەی کە چاوەڕێی چییان لێدەکەیت.

**چاوەڕوانییەکانتان بە ڕوونی دەربڕ**

ئەمڕۆ گلەیی سەرەکی فەرمانبەران لە ژینگە جیاوازەکانی کارکردندا ئەوەیە کە بە تەواوی نازانن چاوەڕوانی چییان لێدەکرێت.زۆر کەس مانگانە مووچە وەردەگرن و چاوەڕوان دەکرێت یارمەتی ڕێکخراوەکە بدەن لە گەیشتن بە ئامانجەکانی، بەڵام ئەم چاوەڕوانییە بە ڕوونی و بە وردی دەرنەبڕدراوە، کاتێک خەڵک بە تەواوی ئاگاداری ئەوە نین کە چاوەڕوانی چی لێیان دەکرێت، لەوانەیە لە ژینگەی کارکردنیان، ئەوان هەڵوێستی نەرێنی و ڕەشبینانە دەگرنەبەر، ڕوو لە شەڕەکانی پشت پەردە دەکەن، پاڵنەرەکانیان لەدەست دەدەن و ناتوانن زۆرترین سوود بۆ ڕێکخراوەکەیان بهێنن.

سەرکردەکان نەک هەر چاوەڕوانییەکان بە باشی بە کارمەندەکانیان دەگەیەنن، بەڵکو بە وردی بۆیان ڕوون دەکەنەوە. سەرکردەکان دەبێت دڵنیابن لەوەی فەرمانبەران بزانن چی لێیان چاوەڕوان دەکرێت و بۆچی، هەریەکێک لە ئێمە لە جیهانی بازرگانی ئەمڕۆدا دەبێت بزانین بۆچی ئەو کارە دەکەین کە دەیکەین. ناتوانین بەوە ڕازی بین کە شتێکمان پێ بسپێردرێت و پێمان بڵێن چۆن بیکەین. هەروەها دەمانەوێت هۆکارەکانی ئەنجامدانی ئەو کارە بزانین. ئێمە دەمانەوێت بزانین ئەنجامدانی ئەو کارە چ کاریگەرییەکی لەسەر ئێمە هەیە، دەمانەوێت بزانین ئەنجامدانی ئەو کارە چ کاریگەرییەکی لەسەر کڕیاران و کەسانی دیکە هەیە. نیچە جارێک وتی: (( ئەگەر مرۆڤ هۆکارێکی بەس و قەناعەتبەخشی هەبێت، دەتوانێت ڕووبەڕووی هەر بارودۆخێک ببێتەوە.))

بەدرێژایی ساڵان، خۆم ڕاهاتووە کە هەرگیز تەنانەت ئەرکێکی سادەی وەک تایپکردنی نامەیەک بە کەسێک نەدەمەوە . لەم ساڵانە بەم ئاکامە گەیشتم کە هەرچی زیاتر سەبارەت بە کارەکانم ڕونکردنەوە بدرێ لەسەر ڕێژەی هاندان و پابەندبوون وەفاداری بۆ کارەکانیان زیاد دەکات.هەروەها هەرچی کەمتر سەبارەت بە هۆکاری ئەنجام دانی کاری خۆیان بزانن، سەبارەت بە کارەکە بێ باک تر دەبن.

تەنها بە ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی ئەنجامدانی کارێک دەتوانیت ئەو هێزە ئازاد بکەیت کە لەناویاندا شاراوەتەوە. تەنانەت مەرج نییە هۆکارێکی باشیش بێت، تەنها هۆکارێکی هەبێت بۆ ئەنجامدانی هەموو شتێک.

**هەمیشە لە مەیدانەکەدا ئامادەبە**

پەیوەندی ڕووبەڕوو باشترین ڕێگایە بۆ کارلێککردن لەگەڵ کەسانی تر. ئەگەر لە ژیانی فەرماندە و سەرکردە گەورەکان بخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە ئەوان هەمیشە لەسەر شانۆ ئامادە بوون، دەگمەنە سەرکردەی گەورە لە پشت مێزەکانیانەوە بدۆزیتەوە، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە تا لە بواری بەڕێوەبردندا بەرزتر ببیتەوە، ئەوا... دەرفەتی زیاترت هەبێت لەسەر شانۆ کات بەسەر بەرە بۆ قسەکردن لەگەڵ کەسانی تر. ئەمڕۆ لە بەڕێوەبردندا دەستەواژەی بەڕێوەبردن لەسەر بنەمای یاخیبوون بەکاردێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە بەڕێوەبەر ئۆفیسەکەی بەجێدەهێڵێت و دەچێتە بەشە جیاوازەکان و لەگەڵ خەڵکدا قسە دەکات لەسەر ئەوەی کە دەیکەن، پێویستە ڕێبازێک بگرێتەبەر کە ڕێگە بدات خەڵک بێنە لات. وەرە قسەت لەگەڵ بکە دەربارەی کێشەکانیان و ئەوەی لە یەکەکانیاندا ڕوودەدات، ئەو زانیاریانەی لە ڕێگەی ئەم گفتوگۆ ڕاستەوخۆیە لەگەڵ کارمەندان و کڕیاران بەدەستت دەهێنن زۆر وردتر و بابەتیانەترن لەو زانیاریانەی کە چەند کاتژمێر، ڕۆژێک یان هەفتەیەک لە ئۆفیسەکەتدا بەسەر دەبەیت.دەستت دەکەوێت باشترین سەرکردەکان تا ٥٠٪ کاتەکانی کارکردنیان لە دەرەوەی ئۆفیسەکەیان لەگەڵ کارمەند و کڕیارەکانیان بەسەر دەبەن.

ئەم ئامادەبوونە بەردەوامە لەگەڵ کارمەندان و کڕیاران ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە پەیوەندیکردن و وەرگرتنی زانیاری لە کڕیاران. پێویستە هەموو سەرکردەیەک بەلایەنی کەمەوە 25%ی کاتەکانی نەک لە پشت مێزێکەوە یان خوێندنەوەی ئامارەکان بەسەر ببات، بەڵکو کارلێککردن لەگەڵ کڕیارەکان و گرنگیدانیان پێبدات.

تا چەند ساڵێک لەمەوبەر ئامێرەکانی پەخشکردنی شریتی ڤیدیۆی ماڵەوە زۆر بەربڵاو و بەناوبانگ بوون، ڕۆژێک پیاوێک چووە دوکانێکی ئەلیکترۆنی لە شاری سانتا کلارا لە ویلایەتی کالیفۆرنیا بۆ کڕینی یەکێک لەو ئامێرانە، لەم دوکانەدا پیاوێکی پیری ژاپۆنی کە بە ئینگلیزی قسە دەکات وە بە قسەی جەنجاڵی قسەی دەکرد، زانیاری لەسەر بەرهەمەکە دەدا، کاتێک ئەم پیاوە ڤیدیۆ پلەیەری ماڵەکەی کڕی و فرۆشگاکەی بەجێهێشت، یەکێک لە هاوڕێکانی پێی گوت: "ئەو پیاوە پیرە ژاپۆنییەت دەناسی؟" ئەو پیاوە ئاکیۆ مۆریتا بوو، یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی کۆمپانیای سۆنی، مۆریتا گەشتێکی کردبوو بۆ ئەمریکا و سەردانی فرۆشگا جۆراوجۆرەکانی کردبوو کە بەرهەمەکانی سۆنییان دەفرۆشت، بۆ ئەوەی فیدباکێکی ڕاستەوخۆی کڕیارانی سۆنی وەربگرێت.

**هەمیشە قایلکەر بن**

ئێستا دوا خاڵی گرنگ لە بواری پەیوەندیکردندا دەکۆڵینەوە. سەرکردەکان زۆر لێهاتوون لە قبوڵکردنی بابەتە جۆراوجۆرەکان بە کەمترین فشار لەسەر ئەوانی تر. سەرکردەکان هەمیشە کەسانی تر ڕازی دەکەن کە هەندێک شت قبوڵ بکەن. سەرکردەکان خەڵک ڕازی دەکەن کە دیدگا و ئامانج و هۆکارەکانی ڕێکخراوەکە قبوڵ بکەن، هەروەها فەرمانبەران ڕازی دەکەن پابەندبن بە کاری جددیتر و درێژخایەنتر و بەرپرسیارێتی زیاتر قبوڵ بکەن. هەموو سەرکردەکان ئەم توانایە

قایلکردنەیان هەیە. جگە لەوەش سەرکردەکان توانای دانوستان و سازشیان هەیە. توانای باشیان هەیە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری بردنەوە-بردنەوە. کۆکردنەوەی کەسانی خاوەن تێڕوانین و پێویستی و هەڵوێستی جیاواز و هاوئاهەنگی ئەم بۆچوونانە بەمەبەستی هاوکاریکردن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ڕێکخراو، یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی سەرکردەیەک.

## بەشی نۆیەم

### سەرکردەکان لە بارودۆخە سەختەکان فێر دەبن

سەرکردەکان هەرگیز وشەی "شکست" بەکارناهێنن. هەرگیز بژاردەیەکیان نییە بە ناوی شکست. سەرکردەکان لە ئەزموونە نەرێنییەکان و ئاستەنگە کاتیەکان فێر دەبن کە لەبەردەمیان دادەنرێت، بەڵام هەرگیز وەک شکست نازانن. ئۆریسن سویت ماردن (نووسەری پاڵنەری) لە شوێنێک بۆ کەسێک نووسیویەتی:((بۆ کەسێک کە دەسەڵاتی خۆی بەکاردەهێنێت ئەو خۆی بە دۆڕاو نازانێت،شتێک نیە بە ناوی شکست بۆ کەسێک کە هەوڵێکی یەکلاکەرەوە و ئیرادەیەکی نەشکاوی هەبێت. بۆ کەسێک کە هەموو جارێک دوای کەوتن هەستێتەوە و وەک تۆپی لاستیکێک لە بەربەستێکەوە دەگەڕێتەوە دواوە، شتێک نییە بە ناوی شکست بۆ کەسێک کە بەرەنگاری دەکات کاتێک هەموو کەسێکی تر وازی لێدەهێنێت و کاتێک هەموانی تر وازیان لێدەهێنن.

ڕۆژێک بەڕێوەبەرێکی گەنج لە تۆماس ج. واتسۆن (دامەزرێنەری کۆمپانیای IBM) پرسیاری کرد: "چۆن بتوانم خێراتر پێشبکەوم لە ژیانی پیشەیی خۆمدا؟"

واتسۆن لە وەڵامدا وتی: ((خێرایی شکستەکەت دوو هێندە زیاد بکە، بە واتایەکی تر تا زیاتر شکست بهێنن و لێی فێربن، خێراتر سەردەکەون.

تەنانەت هەندێک لە سەرکردەکان دەڵێن: "ئەگەر بمانەوێت لە بازاڕدا سەرکەوتووتر بین، پێویستە خێراتر وانە فێربین". ئەگەر ساڵانە لەبری یەک یان دوو شکست، ساڵانە دە یان بیست شکستت بەخۆوە بینی، ئەوا ئەگەری گەیشتن بە پێگە و زانیارییە دڵخوازەکە و زاڵبوون بەسەر بازاڕدا زیاتر دەبێت.

**چارەسەر ئاڕاستە بن**

سەرکردەکان چارەسەر ئاڕاستەن و هەر بۆیە دەتوانن ئارام بن. زاڵبوون بەسەر ئاستەنگ و قەیرانەکاندا، ئەگەر کێشەیەک ڕوویدا، سەرکردەکان زیاتر بیر لە ڕێگایەک دەکەنەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا و بەدوای دۆزینەوەی کەسی هەڵەدا ناگەڕێن و تاوانباری بکەن.

لە کتێبەکەمدا بەناونیشانی "خاڵی قەیران" باسم لە چەند هەنگاوێکی گرنگ کرد کە پێویستە سەرکردەکان بیگرنەبەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیران و ئاستەنگەکان (گەورە و بچوک). ئەم هەنگاوانە بریتین لە:

- ئارام بە و نیگەران و توڕەبە مەبە. بێگومان ئەم کۆنترۆڵکردنی سۆزەکان بە وشە ئاسانە، بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە سەرکردەکان بە ئارامی دەمێننەوە و ڕوونی دەروونی خۆیان
لەم بارودۆخانەدا، چونکە بە بۆچوونی ئەوان توڕەبوون بۆ کێشەیەک کە ناتوانین بیگۆڕین، کارێکی بێهودەیە.
- متمانەت بە تواناکانت هەبێت. لە ڕابردوودا بە سەرکەوتوویی قەیرانەکانت تێپەڕاندووە و ئەمجارەش ئەم توانایەت دەبێت.
ئازایەتیت هەبێت بەرەو پێشەوە بچیت، بەهۆی شەپۆلی لەناکاوی

کێشەکانەوە هێزت لەدەست مەدە. خێرا هەنگاو بنێن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکان.

- زانیاری کۆبکەرەوە پێش ئەوەی هەر بڕیارێک بدەیت، سەرەتا بە تەواوی بزانە کێشەکە چییە و هەموو لایەنەکانی بپشکنە.
- ئیدارەی قەیرانەکان بکە. بەرپرسیارێتی چارەسەرکردنی کێشەکە قبوڵ بکەن، پلان دابنێن و کێشەکە چارەسەر بکەن.
- پەیوەندی کاریگەرت هەبێت لەگەڵ کەسانی تر بە بەردەوامی. خەڵک ئاگادار بکەرەوە، کەمی زانیاری دۆخەکە خراپتر دەکات.
- دەستنیشانکردنی ئاستەنگەکان و لابردنی ئەو بەربەستە سنووردارانەی کە کاریگەری و خێرایی چارەسەری قەیرانەکان کەم دەکەنەوە. تا دەتوانی داهێنەری خۆت دەرببڕە ڕێگە چارەی جیاوازپێشنیار بکە .
- ڕێبازێکی هێرشکەرانە بگرەبەر.دۆخەکە هەڵبسەنگێنە، زانیاری کۆبکەنەوە و دواتر ڕێگەیەکی پێشەوە بگرنەبەر.
- شتەکان بە سادەیی بهێڵنەوە، ڕەنگە قەیرانێک لایەنی جیاوازی هەبێت و پێویستی بە چارەسەری جیاواز هەبێت. تەنها سەرنجت لەسەر گرنگترینەکان بێت.
- هەرگیز بنەما ئەخلاقیەکانت پێشێل مەکە. گرنگ نییە ئەو قەیرانە یان تەحەدایە چەندە کاریگەری خراپی لەسەر مێژوو و تێڕوانینت بۆ ئەوانی تر هەیە، هەرگیز نابێت بنەما ئەخلاقیەکانت پێشێل بکەیت. لەبیرت بێت کە کەسانی تر چاودێری هەموو ڕەفتارێکت دەکەن.
- خۆڕاگربە تا دواجار سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت. چارەسەرکردنی کێشەکە چەندە قورس بێت یان چەند کاتت دەوێت، هەرگیز نابێت وازبهێنیت.

## هونەرمەندانی گۆڕانکاری

سەرکردایەتی تا ڕادەیەکی زۆرپەیوەندی بە بارودۆخ هەیە. زۆرێک لە سەرکردەکان تەنها بەهۆی ئەو بارودۆخانەوە دەگەنە پێگەی سەرکردایەتی کە سەرهەڵدەدەن. من چەندین ژن و پیاوم بینیوە کە ساڵانێکە لە پێگەیەکی ئاساییدا لە ڕێکخراوێکدا ئامادە بوون و تەنها بە هۆی ڕووداوی گێژاو یان ڕووداوی نەرێنی بە ئاراستەی بزووتنەوەی ڕێکخراوەکە گەیشتوونەتە پۆستی سەرکردایەتی، هەروەها زۆر کەسم بینیوە کە لە هەندێک پۆستی سەرکردایەتیدا زۆر بەنرخ بوون بەڵام لە پۆستەکانی تردا بە هیچ شێوەیەک توانای سەرکردایەتیکردنیان نەبوو. هەندێک کەس لە بارودۆخی سەقامگیردا سەرکردەی باشن و هەندێکی تر دەتوانن لە بارودۆخی پشێو و گرژدا سەرکردەی باش بن. ئەمڕۆ لە ئەمریکا سەرکردەکانی کارگە ئابوریەکان هەندێک جار وەک هونەرمەندی گۆڕانکار مامەڵە دەکەن، هەرکاتێک کۆمپانیایەک لە لێواری دارماندا بوو بەهۆی کێشەی دارایی جددی یان گۆڕانکاری لە بازاردا، ئەم هونەرمەندە گۆڕانکارییانە دێنە کردارەوە. ئەم سەرکردانە دەتوانن کۆمپانیاکە لە لێواری دارماندا ڕێکبخەنەوە و بیخەنەوە سەر ڕێڕەوی خۆی. هەندێک جار تەنها لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا ئەم کارە دەکەن دوای ئەوەی هەوڵەکانی پێشووی سەرکردایەتی شکستیان هێناوە، بۆیە سەرکردایەتی بارودۆخی هەیە و بارودۆخی نەرێنی توانای سەرکردە گەورەکان ئاشکرا دەکات، بۆیە هەرکاتێک ڕووبەڕووی دۆخێکی ناخۆش بوویتەوە، وەک دەرفەتێک بەکاری بهێنە، فێربە توانا سەرسوڕهێنەرەکانت پیشان بدەیت کە پێویستە بۆ سەرکردایەتیکردن. ڕووداوە بەدبەختەکان دەرفەتێکە کە لەم ماوەیەدا سەرکردە ڕاستەقینەکان دەناسرێنەوە، ئیپیکتیتۆس، فەیلەسوفی کۆنی یۆنانی لە شوێنێکدا دەڵێت "بارودۆخی بەدبەخت" مرۆڤ ناکاتە مرۆڤ، بەڵکو لەم بارودۆخانەدا تایبەتمەندی ڕاستەقینەی مرۆڤ بۆی

ئاشکرا دەبێت، بەکورتی ، لە دۆخە سەختەکاندایە کە سەرکردەکان ڕاستەقینە دەردەکەون.

## بەشی دەیەم

## تیمێکی پاڵەوان دروست بکە

کاتێک دەڵێین کەس سەرکردە لەدایک نابێت و وردە وردە ئەم تایبەتمەندییە بەدەست دەهێنێت، مەبەستیشمان ئەوەیە کە ئەو تایبەتمەندییە سەرەکییەی کە مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگای پێشکەوتنی خێرا لە بواری بەڕێوەبردندا و دەیکاتە پێشەنگ لە بوارەکەیدا، ئەو توانایەیە کە ئاش پاڵەوانە بۆ دروستکردنی تیمێک، کە توانای کۆکردنەوەی خەڵکە بۆ ئەوەی بە هاوئاهەنگی کاربکەن و ئامانجی گەورە بەدەستبهێنن.

ئەو حەوت بنەما گرنگەی کە دەبێت لەبەرچاو بگیرێن بۆ ئەوەی تیمێکی براوە دروست بکرێت بریتین لە:

١-پەروەردە کردن و سەرۆکێکی شەفاف و دیاریکراو . هەموو کەسێک لە تیمەکەدا دەزانێت کێ بڕیاری کۆتایی دەدات. کەسێک سەرکردەی تیمەکەیە، هەروەها هەمووان دەزانن کێ سەرۆکە، سەرکردە براوەکان کەسانی باش لە دەوری خۆیان کۆدەکەنەوە. بە تاوتوێ کردنی تایبەتمەندی مرۆڤەکان کەسێک بۆ تیمەکەی خۆیان هەڵدەبژێرن کە دەتوانن تایبەتمەندیەکانی ئەو کەسە دەستنیشان بکەیسەرکردەیەک.. سەرکردەیەکی بەهێز هەمیشە کەسانێک هەڵدەبژێرێت کە لە خۆی باشترن و سەرکردەیەکی لاواز هەمیشە کەسانێک هەڵدەبژێرێت کە لە خۆی لاوازترن.

2- گرنگیدانێکی زۆر بە ڕاهێنان و پەرەپێدانی توانا مرۆییەکان. بۆ دروستکردنی تیمێکی براوە پێویستە هەموو سەرنجەکانت لەسەر پاڵنەر و بەهێزکردنی و هاندانی ڕاهێنان و نوێکردنەوەی لێهاتوویی و تواناکانی کەسەکانت چڕ بکەیتەوە.

3- زۆر جەختکردنەوە لەسەر پلاندانان. بۆ ئەم کارە، پێویستت بە یەک شتە و ئەویش کۆکردنەوەی زانیارییە. هارۆڵد جینین لە کتێبە بەنرخەکەیدا سەبارەت بە بەڕێوەبردن، T ئاماژە بە گرنگییەکی گەورەی کۆکردنەوەی زانیاری دەکات.
هەرگیز زانیاری یان زانیاری گریمانەیی و ئەگەری بەکارناهێنێت. بەو شتە ڕازی مەبە کە هیوای ئەوە دەخوازیت ڕاست بێت و پێویستە هەمیشە زانیاری ڕاستەقینە و دروست بەدەست بهێنیت، جێنین پێی وابوو کە زانیاری هەرگیز درۆ ناکات و توانای پلاندانان و حیسابکردنی دروست پەیوەستە بە زانیاری دروستی بازاڕەوە، ئەگەر سەیری ئەدای کارەکەت بکەیت لە تیمێکی براوە یان فەرماندەیەکی براوەت هەبێت و بۆت دەردەکەوێت کە لە شەڕە گەورەکاندا لایەنی براوە هەمیشە بە باشی ئاگادارە.
تیمە براوەکان هەمیشە زانیاری دروست وەردەگرن و لە پلاندانانیاندا بەکاری دەهێنن، ڕەنگە توانای سوپای بەریتانیا بۆ شیکردنەوەی ئەو پەیامە نهێنیانەی کە لە نێوان فەرماندەکان و بنکە سەربازییەکانی سوپای ئەڵمانیای نازیدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، یەکێک بێت لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانی دووەمدا .

هەروەها پێویستە پلانێک دابڕێژیت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شکست. یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی فەرماندە گەورەکان ئەوەیە کە کاتێک دەچنە بەرەکانی جەنگ بەبێ گوێدانە ئەو هەلومەرجەی کە هەن، بژاردەی پاشەکشە و سەرسوڕمانی دوژمنیش لەبەرچاو دەگرن. بۆ نموونە لە شەڕی واتەرو، ویلنگتۆن ١٧ هەزار سەربازە بەئەزموونەکانی وەک هێزێکی یەدەگ لە پشت بەرەیەکەوە هێشتەوە بۆ ئەوەی لە ئەگەری شکست لە شەڕەکەدا و پێویستی پاشەکشە بەکاری بهێنن.
هەرچەندە لەم شەڕەدا نزیک بوو لە لێواری شکست، بەڵام هێشتا ئەو هێزە یارمەتیدەرانەی بەکار نەهێنا. ئەگەر ئەو هێزانەی بەکارهێنابا، دەیتوانی زۆر

بەخێرایی سەربکەوێت و لە لێواری شکستدا نەبوایە، فەرماندەکان هەمیشە پلانێکیان هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خراپترین دەرئەنجام، سەرکردەیەک پلان دادەڕێژێت بەبێ ئەوەی ڕەچاوی خراپترین دەرئەنجام بکات، بەبێگومان هەڵەی کوشندە لە سەرکردایەتی ڕێکخراوەکەدا ئەنجام دەدات.

٤ -هەڵبژاردنی وردی ئەرکەکان. وەک سەرکردەیەک کەسانی باش دادەمەزرێنیت و ئەرکی گونجاو بۆ هەریەکێکیان دیاری دەکەیت بۆ ئەوەی زۆرترین سوود بە ڕێکخراوەکە بگەیەنن، شتێکی جیاوازیان پێبدە، پێگەی ڕێکخراوەیی خۆیان بگۆڕن بۆ ئەوەی دەستنیشانی بکەی کە زۆرترین توانایان لە چ بوارێک دا هەیە .

5- توانای دوورخستنەوەی کەسانی ناشایستە. ئەگەر ئەو کەسانەی هەڵتبژاردووە توانای پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بەنرخیان بۆ ڕێکخراوەکە نەبوو، پێویستە بە زووترین کات داوای لێبوردنیان لێبکەیت و بەم شێوەیە لە ڕێکخراوەکەت دووریان بخەیتەوە. چونکە تا زیاتر تەحەمولی کەسانی ناشایستە لە ڕێکخراوەکەتدا بکەیت، ئەوانی تر بە سەرکردەیەکی ناشایستە دەتزانن، هەروەها تۆ ئەو بیرۆکەیە بەهێز دەکەیت کە دەتوانیت لەو ڕێکخراوەدا ناشایستە بیت و ئاسایشی کارت هەبێت. ئەم دۆخە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پاڵنەرەکانی ئەوانی تر و لە ئەنجامدا کەمکردنەوەی ئەو خزمەتگوزارییە بەنرخانەی کە پێشکەشی ڕێکخراوەکە دەکەن.

6 پەیوەندی باشتر. یەکێک لە خاڵە لاوازە سەرەکییەکانی هەر ڕێکخراوێک نەبوونی پەیوەندییە تێیدا، نەبوونی پەیوەندی واتا نەبوونی ڕۆیشتنی زانیاری پێویست لە نێوان چینەکانی سەرەوە و خوارەوە، هەروەها چینەکانی خوارەوە.. بۆ ئەوەی تیپێکی پاڵەوان هەبێت ، دەبێت پەیوەندی ئازادمان هەبێت بۆ ئەوەی خەڵک بتوانن بە ئاسانی ئەو زانیاریانەی کە پێویستیانە لە هەموو بەشێکی ڕێکخراوەکە وەربگرن.

-7-پابەندبوون بە سەرکردایەتی . پابەندبوون بە سەرکردایەتی تاکە هۆکارێکە کە دەتوانێت پاڵنەرێک بێت بۆ کارمەندان بە مانایەکی ڕاستەقینە. کاتێک مرۆڤ بەیانیەکەی بە ئامانجی سەرکردە و باشترین دەست پێدەکات، ئەوا بە درێژایی ڕۆژەکە وروژاندن و پابەندبوونێکی بەرزی دەبێت. هەر بۆیە سەرکردەکان هەمیشە شتگەلێکی وەک سەرکەوتن و باشتر بوون لەوانی تر لە مێشکیاندایە.

## بەشی یازدەیەم

## تیشک خستنە  سەر ئەنجامەکان

سەرکردەکان زیاتر ئاڕاستەی ئەنجامەکانن نەک چالاکییەکان. ئەگەر ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت نەتباتە سەر ئەنجامێکی بەنرخ، لە ڕاستیدا کارێکی بێ نرخە، سەرکردەکان هەمیشە ئەو ئەنجامە لەبەرچاو دەکەن کە لێیان چاوەڕوان دەکرێت.

بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکە دەبێت  ئەم چوار پرسیارە گرنگە چەندین جار لە خۆت بکەیت.

1 کام لە چالاکییەکانم زۆرترین بەها دەهێنێن؟  چ شتێک دەتوانیت بکەیت بۆ ئەوەی زۆرترین بەها بۆ کار و ڕێکخراوەکەت دروست بکەیت؟  ئەمانە ئەو چالاکییانەن کە پێویستە سەرنجیان لەسەر بێت.

2- بەشەکانی ئەنجامە سەرەکییەکانم چین؟  دەگمەنە پۆستێکی ڕێکخراو زیاتر لە پێنج بۆ حەوت بەشی سەرەکی ئەنجامەکانی هەبێت.  پێویستە لەم بوارانەدا بەنرخترین ئەنجام بەدەست بهێنیت بۆ ئەوەی بتوانیت بە سەرکەوتوویی هەموو بەرپرسیارێتیەکانت جێبەجێ بکەیت.  دوای دەستنیشانکردنی بەشی ئەنجامە سەرەکییەکان، پێویستە بەرزترین پێوەرەکانی کارایی بۆ دابنێیت و هەوڵبدەیت ئەم

ستانداردە دانراوانە بەدەستبهێنیت. لەبیرت نەچێت کە کەسانی تر چاودێری تۆ دەکەن.

٣- کام کارەیە کە دەتوانم بیکەم (و تەنها من دەتوانم بیکەم) کە ئەگەر بە باشی ئەنجام بدرێت، زۆرترین بەها بۆ کۆمپانیاکە دەهێنێت؟ئێوە ئەرک و بەرپرسیارێتیتان هەیە کە دەبێت بە تەنها خۆت جێبەجێی بکەن، و ئەگەر نەیکەن ، بە هیچ شێوەیەک بە ئەنجام ناگەن .

4- بەنرخترین سوود چییە کە دەتوانم لە کاتەکانم وەربگرم؟ئەمە پرسیارێکی زۆر کلیدی و گرنگە، ئەرک هەیە تەنها تۆ دەتوانیت بیکەیت. زۆرێک لە سەرکردەکان ناتوانن هەموو ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن ، چونکە پشت بە ئەنجامدانی ئەو ئەرک و چالاکییانە دەبەستن کە لە ڕاستیدا گرنگ نین.باشترین سەرکردەکان دەزانن کە دەبێ بۆ چ بابەتێک موچە بدەن و هەروەها چ کارێک بەشێک لە چاوەروانیەکانی کۆمپانیاکەیان نیە .

**ئەولەویەتەکان دیاری بکە**

یەکێک لە کارامەیی سەرەکی بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامە بەنرخەکان بریتییە لە توانای یەکەمایەتیدان بەو ئەرکانەی کە لەبەردەستدان. زانینی ئەو چالاکییانەی زۆرترین بەهایان هەیە بە تەنیا بەس نییە. سەرکردەکان ئەرکە جیاوازەکان لە پێشینە دادەنێن و بەم شێوەیە تەنها کار لەسەر گرنگترین و بەنرخترین چالاکییەکان دەکەن.

یەکێک لە شێوازە کاریگەرەکان بۆ یەکەمایەتی دانانی ئەرکەکان بەکارهێنانی شێوازی ABCDE یە، بۆ ئەمەش سەرەتا دەبێت هەموو ئەرکەکانت لیست بکەیت و ئەولەویەتەکانیان دیاری بکەیت. ئەو چالاکیەی کە ئەولەویەت A ی هەیە چالاکییەکی گرنگە کە دەبێت ئەنجام بدرێت، ئەنجامنەدانی ئەم پۆلە ئەرکە لێکەوتەی خراپی بەدواوە دەبێت. ڕەنگە تەرخانکردنی جۆری A ی تۆ زیاتر لە یەک بێت، لەم

حاڵەتەدا دەتوانیت سەردێڕەکانی A-2-1-A و هتد بەکاربهێنیت بۆ دیاریکردنی ڕێزبەندیەکەیان. لە نێو ئەمانەدا A-1 گرنگترین ئەرکە کە ڕووبەڕووت دەبێتەوە، دوای ئەوە A-2 یە.

ئەرکی جۆری B ئەرکێکە کە پێویستە تەواو بکرێت و جێهێشتنی دەتوانێت لێکەوتەی نەرێنی هەبێت. بەڵام ئەم دەرئەنجامانە بەقەد دەرئەنجامەکانی ئەنجامنەدانی چالاکییەکانی جۆری A توند نین. نابێت کار لەسەر ئەرکەکانی جۆری B بکەیت تاوەکو ئەرکەکانی جۆری Aت هەبێت. چالاکییەکانی جۆری C ئەو شتانەن کە باشن و چێژبەخشن، بەڵام هیچ ئەنجامێکی ئەرێنی و نەرێنییان لەسەر گەشەپێدانی پیشە و ڕێکخراوەیی نییە.

خوێندنەوەی گۆڤار یان ڕۆژنامەیەک ڕەنگە چێژبەخش بێت و ئەگەری ئەوە هەیە زیاتر دەربارەی کاروباری سیاسی بزانیت.یان دابینکردنی وەرزشکردن، بەڵام هیچ بەهایەک بۆ کارەکەت ناهێنێت. هەرگیز مەچۆ بۆ چالاکییەکانی جۆری C لە کاتێکدا هێشتا ئەرکی جۆری B ماوە. ئەرکەکانی جۆری D بریتین لە چالاکییەکان کە دەتوانیت بیدەیت بە کەسێکی تر، یەکێک لە پرەنسیپە گرنگەکانی بەڕێوەبردن ئەوەیە کە هەموو شتێک کە دەتوانرێت ڕادەست بکرێت، ڕاسپێردرێت. ئەوەندە ئەرکت لەبەردەمدایە کە تەنها خۆت دەتوانی مامەڵەی لەگەڵ بکەیت و باشتر وایە کاتەکانت بەسەر نەبەیت بۆ ئەو کارانەی کە دەتوانرێت بە کەسانی تر بسپێردرێت، لەخۆت بپرسە: "کام کارە دەتوانم بیکەم و تەنها من دەتوانم بیکەم و زۆرترین شت دەهێنێت". ئەنجام و سوودەکانی بۆ کۆمپانیاکە؟ ئەگەر نەتتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزیتەوە، دەتوانیت داوا لە کەسێکی تر بکەیت وەڵامی بداتەوە. هەروەها ئاگاداربە لە یەکەمایەتیدان بە ئەرکەکان بۆ ئەوەی نابێت ئەرکەکانی D ئەنجام بدەیت کاتێک ئەرکی C ماوە.

چالاکییەکانی جۆری E ئەو چالاکییانەن کە پێویستە بە تەواوی نەهێڵرێن. تەنانەت نابێت ئەم جۆرە ئەرکانە لەسەر مێزەکەت بن. ئەم جۆرە ئەرکانە هیچ ئەنجام و

بەکارهێنانێکیان نییە، ڕەنگە ئەو ئەرکانە لە ڕابردوودا بەنرخ بوون، بەڵام ئێستا سوودیان بۆ تۆ نەماوە، ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە نەدەبوو ئەنجامی بدەیت، خشتەی کارەکەت بسڕەوە.

شتێکی گرنگ لە بەکارهێنانی شێوازی یەکەمایەتیدان بە ABCDE ئەوەیە کە هەرگیز نابێت کار لەسەر چالاکیەکی کەم ئەولەویەت بکەیت کاتێک ئەرکێکی گرنگتر هەیە،لەسەر ئەو چالاکیانە کار مەکە کە پێشەنگایەتی نزمیان هەیە.

## سەرنجدانی کارمەندان لەسەر کاریگەری چڕ بکەوە

سەرکردەکان بوارە سەرەکییەکانی ئەنجامەکان دەگەیەنن بە کارمەندەکانیان لە هەمان کاتدا سەرنجیان لەسەر ئامانجەکانیان دەبێت و هانیان دەدەن کە ئەرکە گرنگەکانیان لە پێشینەدا دابنێن. سەرکردەکان دەزانن کە توانای تەرکیزکردن لەسەر ئەو ئەرکانەی زۆرترین ئەنجام دەهێنن تەنها کلیلی بەدەستهێنانی گەورەترین کاریگەریی مرۆیی نییە، بەڵکو کلیلی بەدەستهێنانی کاریگەریی ڕێکخراوەیی و سەرکردایەتیشە.

ئەگەر ئەو کارانە بکەیت کە لە لیستی بوارە سەرەکییەکانی ئەنجامەکاندا نین، تەنانەت ئەگەر زۆر باشیش ئەنجامی بدەیت، ئەوا ئەو ئەنجامانەی بەدەستت دەهێنن بە هەر شێوەیەک بێت بێ بەها دەبن. بەڵام ئەگەر یەک یان دوو ئەرکی یەکەمایەتی بەرز بە باشی ئەنجام بدەیت، دەتوانیت ئەنجامێکی بەنرخ بۆ خۆت و ڕێکخراوەکە دروست بکەیت.

## بەشی دوانزەهەمین

## خولیای سەرکردایەتی

سەرکردەکان حەزێکی بەهێزیان هەیە بۆ سەرکردایەتیکردن و ئاراستەکردنی شتەکان. جێگای سەرنجە بزانین سەرکردەکان پشت بەخۆیان دەبەستن و زۆر خۆسەنتەرن، بە واتایەکی تر سەرکردەکانی تر مرۆڤی سەربەخۆن و ئارەزووی زۆریان هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی شتەکان، ئەوان حەز دەکەن خۆیان بڕیاردەر بن.

بەم دۆخەشەوە سەرکردەکان دەزانن بۆ ئەوەی پێگەی سەربەخۆیی و کۆنترۆڵکردن بەدەست بهێنن، سەرەتا دەبێت فێری گوێڕایەڵی بن. ئەو فەرمانانەی کە وەریدەگرن بە باشی جێبەجێ دەکەن. هەموو فەرماندە سەربازییە گەورەکان سەردەمانێک سەرباز بوون و فێربوون چۆن بە باشی پابەندی فەرمانەکان بن.

سەرکردەکان مەیلیان زۆریان هەیە فەرماندەیی بکەن. سەرسامن بە کۆنترۆڵکردنی کاروبارەکان و قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی. زۆر کەس نایانەوێت ببنە سەرکردە، پێویست ناکات هەموو مرۆڤەکان ببنە سەرکردە، بەڵام ئەگەر تۆ یەکێکیت لەوانەی خەونی سەرکردایەتیت هەیە و ئارەزووی بەهێزت هەیە بۆ ئەوەی کاروبارەکان بگرێتە ئەستۆ، دەبێت خۆت ئامادەبکەیت بۆ قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی.

**بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی قبوڵ بکە**

سەرکردەیەک حەوت بەرپرسیارێتی سەرەکی هەیە و ئەو بەرپرسیارێتیانە لە هەر بارودۆخ و ڕێکخراوێکدا لەگەڵیدا دەبێت. کەسێک کە دەیەوێت ببێتە سەرکردە، پێویستە هەوڵبدات لەم حەوت بوارە سەرەکییەی بەرپرسیارێتیدا سەرکەوتوو بێت:

**بەرپرسیارێتی یەکەم:** دانانی ئامانج و بەدیهێنانی، باشترین سەرکردەکان ئەو ئەرکانە دیاری دەکەن کە دەبێت لە هەر بوارێکی گرنگی هەر ڕێکخراوێکدا ئەنجام بدرێن و دەتوانن ئەو ئامانجانە بەدیبهێنن. ئەم ئامانجانە بۆ چالاکییە ئابوورییەکان بریتین لە دانانی ئامانج بۆ گەشەی فرۆشتن و قازانج. لە قۆناغی داهاتوودا، پێویستە هەموو پلاندانانی ستراتیژی و بەبازاڕکردن لە دەوری گەیشتن بەم ئامانجانە بێت.

**بەرپرسیارێتی دووەم:** داهێنان و مارکێتینگ، تەنها ئەو کارە مەکە کە ڕێکخراوەکە تا ئێستا کردوویەتی، بەم شێوازە ناتوانیت بگەیتە کڕیاری نوێ، هەروەها ناتوانیت هەموو ئەو ئامانجانە بەدەست بهێنیت کە تێیدا یەکەم بەرپرسیارێتی خۆت پێناسەت کردووە. داهێنەر بە و دواتر هەموو ئەو کارانەی کە دەیکەیت و دروستی دەکەیت بیفرۆشە.

**بەرپرسیارێتی سێیەم:** بڕیاردان و چارەسەرکردنی کێشەکان، تێپەڕاندنی کێشەکان و تێپەڕاندنی ئاستەنگەکانی سەر ڕێگای سەرکەوتن، هەروەها بڕیاردان لە بارودۆخە سەختەکاندا، لە ئەرکەکانی سەرکردەدان، بۆ ئەوەی چارەسەر بکرێت، نەبوونی بەخت لە بەدەستهێنانی هەروەها هەڵوێستی چاوەڕوانکراو بە کێشەیەکی چارەسەرنەکراو دادەنرێت.

**بەرپرسیارێتی چوارەم:** دانانی ئەولەویەتەکان و گرنگیدان بە ئەرکە سەرەکییەکان هیچ سەرکردەیەک دەستڕاگەیشتنێکی بێسنووری بە سەرچاوە مرۆییەکان، پارە، یان سەرچاوەی دیکە نییە. هەر لەبەر ئەم هۆکارە دیاریکردنی شێوازی گونجاو بۆ

بەکارهێنانی سەرچاوەکانی ڕێکخراو بۆ ئەوەی زۆرترین سود بۆ سەرکەوتنی ڕێکخراو بهێنێت یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرکردە. کات دەگمەنترین سەرچاوەیە و ئەو سەرکردانەیە کە نازانن چۆنیەتی کات بەکارهێنان مەحکوم دەبن بە شکست.

**بەرپرسیارێتی پێنجەم:** کە نمونە بوون بۆ کەسانی تر، کارمەندان هەمیشە سەرکردەکەیان دەبینن و لاسایی ڕەفتار و تایبەتمەندییەکانی دەکەنەوە، کەسایەتی و خووی کارکردنت دەبێت نمونەیەکی بەنرخ بێت بۆ کارمەندەکانت.

**بەرپرسیارێتی شەشەم:** قەناعەت پێکردن و هاندانی کەسانی ترە بۆ ئەوەی شوێنت بکەون. سەرکردە پاڵنەرێکە بۆ ئەندامانی تیمی یەکەی یان ڕێکخراوەکەی بۆ قبوڵکردنی دیدگای ئەرک و ئامانجە تایبەتەکانی کە بۆ ڕێکخراوەکە داناوە. سەرکردەیەک کە شوێنکەوتووی نەبێت، لە ڕاستیدا سەرکردە نییە و گرنگ نییە چ پێگەیەکی ڕێکخراوەیی هەیە.

**بەرپرسیارێتی حەوتەمی:** بەدواداچوونی ئامانجەکان و گەیشتن بەو ئامانجانە، چاوەڕوان دەکرێت سەرکردەکان بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکان و هیچ بیانوویەک قبوڵ ناکرێت بۆ نەگەیشتن بە ئەنجامەکان، بەرپرسیارێتی حەوتەمی سەرکردایەتی لە ڕاستیدا بە گرنگترینیان دادەنرێت. هەروەک چۆن یاریزانێکی تۆپی پێ کە دەیەوێت دەست بەسەر تۆپدا بگرێت، سەرکردەیەکیش پێشوازی لە بەرپرسیارێتی دەکات. سەرکردەکان دەیانەوێت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام. ئەوان دەیانەوێت بەرپرسیار بن لە پاڵنانی کارمەندانی ڕێکخراوەکە و بەدیهێنانی ئەو ئەنجامانەی کە پێویستن بۆ سەرکەوتن. سەرکردەکان زۆر باش دەزانن سەرکەوتن تەنها لە ڕێگەی بەشداریکردنی فەرمانبەرانەوە بەدەست دێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەیانەوێت تاکە کەس بن کە لەم نێوەندەدا فەرمان دەدەن.

**ئامادەکاری بکە بۆ قبوڵکردنی دەرئەنجامەکان**

ئەوانەی دەیانەوێت پێشەنگایەتی بکەن دەزانن کە لە کۆتاییدا بەرپرسیار دەبن لە ئەنجامەکان جا ئەنجامەکان باش بێت یان خراپ، لە ڕاستیدا سەرکردەکان پێشوازی دەکەن لە بەرپرسیارێتی ئەنجامەکان. هەروەها ئەگەر شتێک بە هەڵە ئەنجام بدرێت، ئامادە دەبن بۆ قبوڵکردنی لۆمەی ئەوانی تر.

وەک سەرکردەیەک نابێت بە هیچ هۆکارێک کەسانی ترتاوانبار بکەیت، هەرگیز لە هیچ بارودۆخێکدا گلەیی نەکەیت. دەربڕینەکانی وەک "چی دەبوو ئەگەر..." یان "ئاواتەخوازم..." بەکاتتنەهێنی و لە قسەکردنت بیانسڕیەوە. تەرکیز بکە لەسەر ئەوەی کە دەتەوێت و چیت دەوێت بەدەستی بهێنیت، ئەگەر شتێک پێویستی بە چاکسازی هەبوو، بەرپرسیارێتی چاکسازی لە ئەستۆ بگرە.

ئەوان دەزانن قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی دەرئەنجامەکانی کاروبارەکان وا لە سەرکردەکان دەکات لە ڕوانگەی تاکەکەسیەوە هەست بە بەهێزبوون بکەن، کەسانێک بیانووی جۆراوجۆر دەهێننەوە، کەسانی دیکە تاوانبار دەکەن و بەردەوام گلەیی دەکەن. لە ڕاستیدا توانا و سەقامگیری خۆیان لەدەست دەدەن . ئەم کەسانە قەبوڵیان کردوە کە هیچ کۆنترۆڵیان بەسەر یەوەی کە ڕوودەدات نیە. لە بەرانبەر سەرکردەکان لەوباوەڕە دان کە جڵەوی دۆخەکەیان گرتۆتە دەست ، کەواتە ئەگەربەم شێوەیە نەبوو بە هیچ شێوەیەک بە سەرکردە هەژمار ناکرێن، و هیچ بژاردەیەکیان نەدەبوو جگە لە دەرچوون یان دەستلەکارکێشانەوە. تەنانەت پێشەنگەکانی پلە جیاوازەکان لە کۆمپانیا گەورەکاندا خۆیان بە کارێکی ئازاد دەزانن بە جۆرێک، ڕۆحێکی هاوشێوەی ڕۆحی کارگێرانیان هەیە.هەر ئەم ڕوحە کارئافەرینەیە کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی هەستی بەرپرسیارەتی و قەبووڵکردنی ئەنجامی کارەکان .

**ئێستا باشترین کاتە**

ئەگەر خولیای سەرکردایەتیت هەیە، مەهێڵە بارودۆخی دەرەکی خاوت بکاتەوە، هەر بۆیە ئەوانەی خولیای سووتێنەریان بۆ سەرکردایەتی هەیە چاوەڕێی کاتی گونجاو ناکەن، ئێستا کاتێکی گونجاوە .

بەشێک لە کۆمپانیا گەورەکانی جیهان لە سەردەمی گەشەسەندنی ئابووریدا پێکهێنراون، واڵت دیزنی و بیل هیولێت و دەیڤید پارکارد و تۆم واتسۆن (دامەزرێنەری کۆمپانیای ئای بی ئێم) هەموویان ئەو پێشەنگانە بوون کە کۆمپانیا گەورەکانیان لە کاتی قەیرانی ئابووری سەختی ئەمریکادا پێکهێنا ، هەروەها کۆمپانیا جۆراوجۆرەکانی وەک FedEx، Hyatt، MTV و Trader و هەموویان لە سەردەمی گەشەسەندن پێکهاتبوون. لەبیرت بێت ئێمە سەرکردەی زۆرمان نییە لە جیهاندا. هەرگیز سەرکردە زیاتر لەوە نابێت کە پێویستمانە. هەمیشە روبەروی کەمی سەرکردەین .ئایا خولیای سەرکردایەتیت هەیە؟

# بەشی سێزدەهەم

## ڕۆڵی متمانەبەخۆبوون  لە سەرکردایەتیدا

سەرکردەکان خاوەنی متمانەبەخۆبوونن و وێنەی ئەرێنیان لە خۆیان هەیە و هەست بە بەهای خۆیان دەکەن . متمانەبەخۆبوون واتە ئەو ئاستە بەرژەوەندییەی کە لەخۆتدا هەتە، بەشێکی بنەڕەتییە لە متمانە بەخۆبوون کە پێی دەوترێت کاریگەری. کاریگەری واتە هەستکردن بە لێهاتوویی.باشبوون لەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت و توانای بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامانەی کە پێویستە وەک سەرکردەیەک بەدەستی بهێنیت. متمانەبەخۆبوون زۆر گرنگە چونکە ئەو هەستەی لەناو خۆتدا هەتە. هەروەها ئەو بیروباوەڕ و بیرۆکانەی کە هەن لە قووڵایی مێشکتدا، دەبێتە ڕێبەرت بۆ ئەدای کارەکانی دەرەوەت . ستیڤ ڕۆجەرز (بەڕێوەبەری جێبەجێکاری پێشوو) لە شوێنێکدا وتی: "شێوازی هەستکردنت بەخۆت دیاریکەری سەرەکییە بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانت وەک کەسێک لە شوێنی کارەکەت وهەروەها وەک بەڕێوەبەرێک". سەرکردایەتی پێویستی بە ئارامی و ڕوونی و کۆڵنەدان هەیە و ئێمە توانای بینینی جیهانین بە شێوەی راستەقینە و هەروەها بە زۆرێک لە تایبەتمەندییەکانی .
سەرکردەیەک کە ڕووبەڕووی گومان لەخۆی بێت و هەستی بەهای کەمی هەبێت، ناتوانێت ئەو سیفەتانەی هەبێت.

**ڕەنگە ڕێگاکانی زیادکردنی متمانەبەخۆبوون**

سەرکردەکان خۆیان دەناسن و خۆئاگایی بەرزیان هەیە. کاتێکی پێویست بۆ بیرکردنەوەی قووڵ و خۆڕاگری تەرخان دەکەن. سەرکردەکان دەزانن چی پاڵنەریان بۆ دروست دەکات. ئەوان پاڵنەرە ڕاستەقینەکانیان دەزانن . لە هەمان کاتدا ڕوانگەیەکی زۆر بابەتیانەیان بەرامبەر بەخۆیان هەیە و ئەسیری هەستە ناوەکیانیان نابن ، بە واتایەکی تر، غرور و خۆبەگەورەزانینی ئەوتۆیان نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا، زۆر شانازی بە خۆیان دەکەن.

هە ڕوە ها تە نها کار بۆ ئە وە دە کە ن کارێک بکەن کە دە توانن زۆر بە باشی ئە نجام بدە ن. بە پێی ئە وە ی کەخۆیان دە ناسن، تە نها کار و ئە ڕک یان چالاکییە ک قبوڵ دە کە ن کە بە باشترین شێوە توانای ئە نجامدانیان هە یە . ئەوان دەزانن کە هەموو کارێک کە ئەنجامی دەدەن کاریگەری ئەرێنی یان نەرێنی لەسەر وێنەی گشتی خۆیان وەک سەرکردەیەک هەیە، بۆیە تەنها ئەو شتانە قبوڵ دەکەن کە دەتوانن بە باشی ئەنجامی بدەن.

ئەوان سەرنجیان لەسەر خاڵە بەهێزەکانیانە و لە خۆیان دەپرسن: "ئایا من سیفەت و توانای ئەوەم هەیە کە ئەم کارە بە شێوەیەکی ناوازە ئەنجام بدەم؟" ئایا ئەم کارە دەتوانێت یارمەتیم بدات بۆ پێشکەوتن؟ ئەگەر نەتوانن شتێک بە شێوەیەکی نائاسایی بکەن، ئەوا قبوڵی ناکەن. هەمیشە بەدوای ئەنجامە بەنرخەکاندا دەگەڕێن و ئەنجامی ئاسایی لەبەرچاو ناگرن. سەرکردەکانیش لەگەڵ خۆیان ڕاستگۆن. ئەوان بە شێوەیەکی ورد خۆیان هەڵدەسەنگێنن. خۆبەگەورەزان و خۆویست نین، هەروەها زیادەڕەوی لە سیفەت و تواناکانیان ناکەن. توانای ئەوەیان هەیە سەیری دەرونیان بکەن و لە خۆیان بپرسن "ئایا ئەمە کارێکی دروستە لەم کاتەدا؟"

**چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسانی تر دەکەیت؟**

ئەو سەرکردانەی کە متمانەبەخۆبوونیان بەرزە، ڕێبازێکی نابەرگرییان هەیە بەرامبەر بە کەسانی دیکە. ئەوەندە هەست بە دڵنیایی دەکەن کە دەتوانن لە هەڵەکانیان فێربن و ئاستەنگەکان تێپەڕێنن. لە لایەکی ترەوە کەسێک کە سیفەتی سەرکردایەتی نەبێت، هێزی ناوەوەی نییە بۆ تێپەڕاندنی هەڵەکان یان ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکان.

هەروەها غەیرە سەرکردەکان ئەوەندە متمانەبەخۆبوونیان نییە کە بتوانن خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان دەستنیشان بکەن ، بەڵام سەرکردەکان لە هەمان کاتدا، خاڵە لاوازەکانیشیان بە باشی دەزانن و دەیانەوێت بەسەر ئەو خاڵە لاوازانەدا زاڵ بن. بێگومان لە نێوان گلەییکردن لە خاڵە لاوازەکان و لە لایەکی ترەوە جیاوازییەکی قووڵ لە نێوانیاندا هەیە، ئەم جیاوازییە بەهۆی متمانەبەخۆبوونەوە دروست دەبێت، سەرکردەکان دەزانن کە کامڵ نین، بەڵام دەزانن کە لێهاتوویی و لێهاتوویی دیکەیان هەیە.

کەمی متمانەبەخۆبوون لە شێوازی مامەڵەکردنی مرۆڤەکان لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەبینرێت. ئەو کەسانەی کە متمانەبەخۆبوونیان نزمە، بە شێوەیەکی خۆبەزلزان و ناخۆش مامەڵە لەگەڵ ئەوانی تردا دەکەن، بەتایبەتی ژێردەستەکان و بەم شێوەیە دەیانەوێت هەست بە باشی بکەن، بەڵام سەرکردە کاریگەرەکان بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ هەمووان دەکەن، جا ژێردەستە بن یان سەرووتر. ڕیچارد برانسۆن (دامەزرێنەری کاریزماتیکی ڤێرجین گروپ) جارێک لە زنجیرە تەلەفزیۆنییەکدا وەک شۆفێری لیمۆزین ڕۆڵی خۆی بینیوە، دواتر چاودێری ڕەفتاری بەڕێوەبەرانی

کۆمپانیاکەیان کردووە بەرامبەری وەک شۆفێری ئۆتۆمبێل. ئەو بەڕێوەبەرانەی ڕەفتارێکی ناخۆشیان لەگەڵدا کردووە، لە کارەکانیان دوورخراونەتەوە. لە ڕاستیدا ئەم کۆمەڵە بەڕێوەبەرە دەرکراوانە تایبەتمەندی پێویستیان نەبوو بۆ سەرکردایەتییەکی کاریگەر.

**باوەڕت بە خۆت هەبێ**

بۆ ئەوەی متمانەبەخۆبوونت هەبێت سەرەتا دەبێت کارەکانت بە شێوەیەکی باش ئەنجام بدەیت. سەرکردەکان پابەندن بە ئەدای نایاب و خۆیان لەبەرامبەر کارەکان دا بە پابەند دەبینن. ئەوان بە هیچ شتێکی کەمتر لەم ڕازی نین و چاوەڕوانی ئەدای وەها نایاب لە کەسانی دیکە دەکەن. ئەوان دەیانەوێت بەشداری بە 10%ی کەسانی پێشەنگ لە بواری چالاکییەکانیاندا بکەن .

گەیشتن بە ئەدای بەرز یەکێکە لەو ڕێگایانەی کە کەسانێک کە متمانەبەخۆبوونیان کەمە دەتوانن متمانەبەخۆبوونیان بەهێز بکەن. هەنگاوی یەکەم ئەوەیە بزانن کە هەموو شتێک مومکینە، خێزانەکەم هەژار و لە دۆخێکی نالەباردا بوو، دەرفەتی زۆر لەبەردەستدا بوو، من هیچم نەبوو، و بەهۆی ئەم دۆخە خراپەی خێزانییەوە، هەمیشە تووشی کەمبوونەوەی متمانەبەخۆبوون دەبووم و ئەوەش بوو کە ڕێگری لێدەکردم بۆ پێشکەوتن، تەنانەت ئەگەر شتێکم بە شێوەیەکی باشیش کردبا، نەمدەویست لەبەرچاو بگرم خۆم هۆکاری ئەوە بووم، و تەواوکردنی سەرکەوتووانەی ئەو کارە بە ئەنجامی بەخت و ڕێکەوتم دەزانی. تا دواجار لە تەمەنی ٢٨ ساڵیدا گەیشتمە خاڵێک کە ژیانی منی گۆڕی. من تێگەیشتم کە هەر تاکە کەسێک کە لە 10%ی سەرەوەدایە لە هەر بوارێکدا بێت لە سەرەتاوە ئەوەندە گەورە نەبووە لە شوێنێکی نزمتر لە

(بەزۆری 10%ی خوارەوە لەو بوارەدا)دەستی بەکار  پێکردوە. ئەمڕۆ ئاستێکی زۆر باشیان هەیە، ڕۆژ گارێک  ئاستیکی زۆرخراپی هەبووە.

لێرەدایە کە بەرپرسیارێتی بەهێزکردن و گەشەکردنی خۆمم قبوڵ کرد، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ژیان وەک چێشتخانەیەکی خۆخزمەتگوزاری وایە و بۆ ئەوەی ئەنجامێکی باش بەدەست بهێنم، دەبێت هەستم و بەرپرسیارێتی خزمەتکردنی خۆم لە ئەستۆ بگرم. بۆ ئەم کارە  دوو هەنگاوی پێویست پێویستە بهاوێژە ، یەکەم: چوونە ناو ڕیز و دووەم: مانەوە لە ڕیز. چوونە ناو ڕیز واتە بڕیاردان بۆ باشترکردنی خۆت و کارکردن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت هەموو ڕۆژێک و مانەوە لە ڕیزدا، واتە نەبەخشین و خۆبەدوورگرتن لە هەوڵی کورتخایەن و پچڕپچڕ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان.لە ڕاستیدا نابێت دوای کەمێک هەوڵدان وازبهێنیت و بگەڕێیتەوە بۆ دۆخی پێشوو.

هەروەها پیاوێک بە ناوی بۆب سیلڤەرا لە یەکێک لە سیمینارەکانم لە شیکاگۆ بەشداری کرد. دووجار هاوسەرگیری کردووبوو و هەردوو جارەکە جیابووەتەوە، کێشی زیادە و بێکار بووە و قەرزێکی زۆری لەسەر بووە. ئەو پێی وابوو کە ئەوانی تر یان چارەنووس ئەم کێشانەیان لە ژیانیدا دروست کردووە. ژیان لە ڕوانگەی ئەوەوە نادادپەروەرانە بوو و هەموو دونیای بە هەمان ڕوانگە دەبینی. تەنها لەبەر پێداگری یەکێک لە هاوڕێکانی هاتە سیمینارەکەم و بە هیچ شێوەیەک هەستێکی باشی لەم بەشداریە دا نەبوو، چونکە بە هیچ شێوەیەک باوەڕ بە بابەتە پاڵنەرەکان نەبوو. بەڵام کاتێک لە بەشێکی سیمینارەکەدا گوتم سروشت بێلایەنە و ئێمەین کە ژیانمان دروست دەکەین، بۆب سیلڤەر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو بەرپرسیاری سەرەکییە لەو کێشانەی کە لە ژیانیدا ڕوویانداوە. ڕێگای سەرکەوتنی گرت چونکە لەبری ئەوەی سەرنجی لەسەر ئەو شتانە بێت کە دەیەوێت، تەنها سەرنجی لەسەر ئەو شتانە بوو کە نەیویستووە. هەر لەوێشەوە بڕیاریدا ژیانی خۆی بگۆڕێت و لە ماوەی ساڵێکدا کارێکی دەستکەوت و دووجار لەو کارەدا پلەی بەرزکرایەوە. هەروەها 15

کیلۆ کێشی دابەزاند و هاوسەرگیری کردەوە و پێکەوە ژیانێکی خۆشیان دەستپێکرد، لەڕاستیدا متمانەبەخۆبوون دەتوانێت ژیان بگۆڕێت.

متمانەبەخۆبوون واتە باوەڕبوون بەخۆت. متمانەبەخۆبوون ئەو خۆڕاگری و تەرکیزەت پێدەبەخشێت بۆ ئەوەی لەسەر ڕێڕەو بمێنیتەوە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

## بەشی چواردەیەم

## نمونەیەک بە بۆ ئەوانی تر

کاتێک لە پۆستی سەرکردایەتیدایت پێویستە هەمووان گرنگی بە قسەکردن و ئەدای کارەکەت بدەن. ڕەفتارەکانت دەبنە نمونەیەک بۆ هەڵسوکەوتی ئەندامانی تری تیم و هەروەها کەسانی ڕێکخراوەکەت، تۆ نمونەیەکی بۆ ئەوانی تر و ئەوانی تریش ئەم نمونەیە پەیڕەو دەکەن . ئەلبێرت شوایزەر دەیگوت: "دەبێت منداڵان لە قوتابخانەکاندا فێر بکەین بە دیاریکردنی نمونەیەک بۆیان، چونکە هیچ شتێکی تر ناتوانێت ئەوەندە فێریان بکات ". مارشال گۆڵدسمیت( یەکێک لە ڕاهێنەرە بەناوبانگەکانی بواری ڕاهێنانی بەڕێوەبردن، لە توێژینەوەیەکدا دەریخست کە تەنانەت یەک تایبەتمەندی ڕەفتاری سەرکردەیەک دەتوانێت کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر ڕەفتاری کۆمەڵەیەکی گەورەی خەڵک هەبێت. ) با پێکەوە هەندێک لەو تایبەتمەندیانە بکۆڵینەوە کە مرۆڤەکان لە سەرکردەکانیدا دەیبینن و بەو پێیە ڕەفتارەکانیان ئاراستە بکەین.

## هەرگیز فێڵ مەکە

هەرگیز درۆ و فێڵ مەکە و پێگەی خۆت خراپ بەکار مەهێنە، بەرپرسیارێتی کارەکانت قبوڵ بکە.کاتێک لە پێگەیەکی دەسەڵاتدایت، ڕەنگە ئاسانترین ڕێگە بێت بۆ ئەوەی کەسانی دیکە تاوانبار بکەیت بەهۆی ئەنجامە خراپەکانەوە. کەس بە تۆمەتی فێڵکردن و درۆکردن سەرزەنشتت ناکات، چونکە هەموویان دەیانەوێت لە کارەکەی ئێستایان بمێنێتەوە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئاگاداری پرۆسەکە نین. ئەوان ڕەفتارەکانت دەبینن و زوو بەو ئەنجامە دەگەن کە ڕەنگە ڕاستگۆیی زۆر پێویست نەبێت لە ڕێکخراوەکەدا. هەندێک جار گەندەڵی دەبێتە هۆی دابەزینی کۆمپانیایەک. نموونەیەک لە فیلمی Enron دەبینرێت. لەم جۆرە بارودۆخانەدا سەرکردایەتی کەشێکی پڕ لە درۆ و فێڵ لە ڕێکخراوەکەدا دروست دەکات و ئەم تایبەتمەندییە ناخۆشانە لە ئاستەکانی سەرەوەی ڕێکخراوەوە بۆ سەرجەم ئاستەکان دەڕژێت. لە زمانی ئینگلیزی نمونەیەک هەیە دەڵێت ((ماسی لە لای سەریەوە دەرزێت)) ئەمە هەمان نیشانەی گەندەڵی لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە. ئەگەر تۆ لە ڕووی کارەکتەری باش و دەستپاکییەوە نمونەیەک نیت بۆ کارمەندەکانت، ئەوا لە ڕاستیدا تۆوی لەناوچوونی کۆمپانیاکەتان چاندووە. لە لایەکی ترەوە ئەگەر بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبیت دەستبەرداری دەستپاکی بیت، فەرمانبەران و سەرکردەکانی تری ڕێکخراوەکە هەموو هەوڵێکیان دەدەن بۆ مۆدێلکردنی سیفەتی باش و دەستپاکیت.

## هەڵوێستی دروستت هەبێت.

سەرکردەکان بەزۆری هەڵوێستێکی ئەرێنی و گەشبینانەیان هەیە. باوەڕێکی پتەویان بە تواناکانیان و ڕێکخستنەکەیان هەیە و ڕێگە نادەن بەربەست و کێشەکان لەناویان ببەن، هەڵوێست ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە لە تێپەڕاندنی کێشە و قەیرانەکاندا.

یەکێک لە باشترین ڕێگاکان بۆ یارمەتیدانی خەڵک بۆ تێپەڕاندنی ئەو کێشە و ئاستەنگانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە ڕێڕەوی پیشەکەیاندا، ئەوەیە کە گەشبینی خۆتیان بۆ بگوازیتەوە. بە چاودێریکردنی شێوازی مامەڵەکردنت لەگەڵ کێشەکان، کارمەندەکان دوو هێندە زیاتر دەسەڵات دەدۆزنەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانیان.

پرۆفیسۆر مارتن سلینگمان لە زانکۆی پێنسیلڤانیا، ئەنجامی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ ۳۵۰ هەزار چاوپێکەوتوو لە کتێبە پرفرۆشەکەیدا بە ناوی (Learned Optimism) کەڵک وەردەگرێت و سەلماندی کە کەسانی سەرکەوتوو زۆر گەشبینترن لە کەسانی ئاسایی یان ئەو کەسانەی سەرکەوتوو نەبوون. ئەو بەو ئەنجامە گەیشتووە کە گەشبینی لە هەموو کەسێکی دیکە لە کەسانی سەرکەوتوو دا زیاترە .تایبەتمەندییەکی تری ڕەفتاری یان کەسایەتی کەسانی سەرکەوتوو گەشبینییە، بۆیە گرنگە بیروڕاکانت لەسەر ئەوە چڕ بکەیتەوە کە لە داهاتوودا دەتوانی چی بکەیت بۆ باشترکردنی دۆخەکە و نەک لەسەر ئەوەی لە ڕابردوودا ڕوویداوە و دۆخەکەی خراپتر کردووە. تەنانەت ئەگەر لەناوخۆتدا ڕووبەڕووی گومان بوویتەوە، پێویستە ئەو گومانانە بە شاردنەوە بهێڵیتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی دەتبینن هەست بە بوونیان نەکەن. باشترین سەرکردەکان هەرگیز باسی گومانەکانیان بۆ کەسانی تر ناکەن، هیچ شتێک لەوە باشتر نییە کە سەیری سەرکردەیەک بکەیت کە گومانەکانی خۆی دەرببڕێت. ئەو گومانانەی سەرکردە لەناخی خۆیدا هەستی پێدەکات، نەک تەنها زیان بە مۆڕاڵی فەرمانبەران دەگەیەنێت، بەڵکو تەنانەت ڕاستیی ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەن و ئەو ڕێگایەی کە لەسەریەتی لە مێشکی فەرمانبەرەکاندا پرسیار دروست دەکات ئەگەر پێگەی سەرکردایەتیت تێکچوو، دواتر ئەوە گەڕاندنەوەی متمانەی خەڵک ئاسان نابێت و دەبیتە سەرکردەیەکی بێکاریگەر. هەر لەبەر ئەمەشە کە بوون بە نمونە زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتن وەک سەرکردەیەک.

